زنجیرەی ئاگایی ١٣

www.alibapir.net

# هەڵسەنگاندنێکی کاری ئیسلامیی

ameer.maktab@yahoo.com

 /AliBapir  /AliBapir  /MediaAmeerOffice

www.alibapir.net

عەلی باپیر



www.alibapir.net

ameer.maktab@yahoo.com

 /AliBapir  /AliBapir  /MediaAmeerOffice

www.alibapir.net

## ناوەندی راهێنان و گەشە پێدان

ناوەندێکە، لە پەیڕەوی نێوخۆی پەسندکراوی کۆنگرەی سێیەمی کۆمەڵی ئیسلامیی کوردستان/عێراق ساڵی ٢٠١٥ وەکو یەکێك لە ئۆرگانە فەرمییەکانی حزب بڕیاری لەسەر دراوە و جێگیرکراوە. ئەرکە سەرەکییەکەی بریتییە لە گرنگیدان بە پەرەپێدانی تواناکان و پێگەیاندنی ئەندامان لە بوارە جیا جیاکان،و بایەخدان بە بواری رۆشنبیری و راهێنان و گەشەپێدانی توانستەکانیان، بەمەبەستی دروستکردنی کادیر و سەرکردەی داهاتوو لە کایەی حزبی و حکومیدا.

www.alibapir.net

ameer.maktab@yahoo.com

 /AliBapir  /AliBapir  /MediaAmeerOffice

www.alibapir.net

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ عَلَيْكُمْ أَنفُسَكُمْۖ لَا يَضُرُّكُم مَّن ضَلَّ إِذَا ٱهْتَدَيْتُمْۚ إِلَى ٱللَّهِ مَرْجِعُكُمْ جَمِيعًا فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿١٠٥﴾ ﴾ المائدة: ١٠٥

www.alibapir.net

ameer.maktab@yahoo.com

 /AliBapir  /AliBapir  /MediaAmeerOffice

www.alibapir.net

## پێشکەش بێ

بە هەر براو خوشکێکی مسوڵمانی دڵسۆز کە:

مشوورخواردن لە دین و ژینی کۆمەڵگایەکەی، بە بەشێك لە مسوڵمانەتیی و دینداریيەکەی دەزانێ و، دڵنیاشە کە کار و جم و جۆڵی ئیسلامیی زادە و بەرهەمی ئیمان و تەقوایە، بۆیە تاکو پشکی تێیان دا زیاتر بێ، کارەکەی بە پێزتر دەبێ و چاکتری دەتوانێ.

www.alibapir.net


ناوەندی ڕاهێنان و گەشەپێدان وەکو پیشەی سەرەکی خۆی، کارەکانی لەسەر بنەمای زانستی و ئەکادیمی بووندا ئەنجام دەدا و، ئەو بابەتانەشی کە دەیانخاتەڕوو بەرمەبنای گرنگی و پێویستی قۆناغەکەن، بە مەرجی هاوتەریب بوونی لەگەڵ سیاسەتی کۆمەڵی ئیسلامیی دا. دیارە هەر لەم سۆنگەیەشەوە ناوەند هەر لە چرکەساتی دەستبەکاربوونی هەوڵی ئەوەی داوە بەڕێز مامۆستا عەلی باپیر ئەمیری کۆمەڵی ئیسلامیی، بەشداری پێ بکات لەو بابەت و پرسە هەنووکەیی و گەرما و گەرمانەی کە زەرورەتی واقیعەکە دەیانخوازێت، بۆ ئەم مەبەستەش ناوەند بابەتگەلێکی گرنگ و پڕ بایەخ و بەکەڵکی سەرەتا وەکو پرۆژەی بە خۆداچوونەوە بۆ گەلێك بابەت و هەڵوەستەکردن لەسەر چەند پرسێکی گرنگ و هەستیاری ئەمڕۆ، خستە بەردەم بەڕێزیان، جا دوای هۆنینەوە و تاوتوێکردنیان و ئنجا پیشکەشکردنییان لە میانەی خول و وۆرك شۆپەکانەوە، سوپاس بۆ خوای گەورە ژمارەیەك بەرهەمی دانسقە و بە پیت و پێزیان لێوە بەرهەم هات و بە چاپ گەیەنران، ئەوانی دیکەش کە ماون لەداهاتوویێکی نزیك بە چاپ دەگەیەنرێن، دیارە ئەو بابەتەی

www.alibapir.net

بەردەستتان یەکێکی ترە لە کۆی ئەو بەرهەمانەی کە بەڕێزیان لە ویستگەیەکی چالاکییەکانی ناوەندی راهینان و گەشەپیدان پێشکەشی کردووە، کە ئەویش بریتی بوو لە کردنەوەی خولێك بۆ بەڕێزانی ئەنجومەنی سەرکردایەتی کۆمەڵی ئیسلامیی کە بەڕێز مامۆستا عەلی باپیر بە بابەتێك بە ناونیشانی (چاوپێداگێڕانەوەیەکی کاری ئیسلامیی) بەشداری کرد، کە پێکهاتبوو لە پێنج تەوەری سەرەکی.

هەڵبەتە ئامانجی دوور و نزیکی ئێمە لەو بابەتانەی بەچاپی دەگەیەنین، بە تایبەتیش هی خودی جەنابی مامۆستا عەلی باپیر ئەوەیە کە هەروەکو لە ماددەی (١١)ی بنەما گشتییەکانی کارنامەی ناوەندی راهێنان و گەشەپێدان لە بڕگەی (٦)دا هاتووە: (ناوەند لە سنووری کاری خۆیدا، کاردەکات لەسەر قووڵکردنەوەی بیروبۆچوون و بنەماکان و هێڵە گشتییەکانی کۆمەڵ و تێڕوانینەکانی مامۆستا عەلی باپیر لە ڕووی فیکری و سیاسییەوە). جا ناوەند ویستوویەتی دوایین خوێندنەوە و تێڕوانین و بیروبۆچوونی تازەی مامۆستا بزانرێت، لە مەڕ ئەو تەوەر و پرسانەی لە دووتوێی بەرهەمی چاپکراودا خراونەتەڕوو، بۆ ئەوەی لەلایەن تەواوی ئۆرگانەکانی حیزبەوە کاریان لەسەر بکرێ و تەبەننی بکرێن، دیارە پرسی

www.alibapir.net

هەڵسەنگاندنی کاری ئیسلامیی لە ئێستاو رابردوودا، یەکێکە لە بابەتە هەر سەرەکی و گرنگەکانی ئەم قۆناغە، هەر بۆیە ناوەند بە پێویستی زانی لە ژێر رۆشنایی دید و تێگەیشتنی نوێی بەڕێز مامۆستا عەلی باپیر، خوێندنەوەو شیکردنەوە بۆ ئەم مەسەلەیە بکرێ و هەڵوەستەیەکی جیددیانەشی لەسەر بکرێت، بەمەش لە دەرەنجامدا ئاسۆمان لەلا ڕوون دەبێ و بە ئاراستەیەکی راست و تەندروست هەنگاو بەرەو پێشەوە دەنێین.

ناوەندی راهێنان و گەشەپێدان

٢٠١٩/٣/٢٣

ameer.maktab@yahoo.com

 /AliBapir  /AliBapir  /MediaAmeerOffice

www.alibapir.net

www.alibapir.net

# پێشەكی

إن الحمد لله نحمده ونستعينه ونستهديه، ونعوذ بالله من شرور أنفسنا ومن سيئات أعمالنا، من يهده الله فلا مضل ومن يضلل فلا هادي له، وأشهد أن لا اله الا الله وحده لا شريك له، وأشهد أن محمدا عبده ورسوله، وصلى الله تعالى وسلم وبارك على حبيبنا و شفيعنا وقائدنا ومقتدانا محمد وآله أجمعين من الصَّحب و الأزواج والقرابة والتابعين لهم بإحسان إلى يوم الدين.

سەرەتا دەستخۆشیی لە ناوەندی ڕاهێنان و گەشەپێدان دەكەم، كە ئەم بابەتەیان پێشنیار كرد، هەرچەندە پێشتریش بابەتی (چاوبەخۆداگێڕانەوە) وەك بیرۆكە بۆ بەڕێزانی سەركردایەتیی كۆمەڵی ئیسلامییم پێشنیار كردوە، كە قسەو باسی لەسەر بكرێ و، كۆبوونەوەی تایبەتیی بۆ ئەنجام بدرێت، بە دڵنیاییەوە ئەم نووسینەش بەشێكە لە جێ بەجێكردنی ئەو بیرۆكەیە.

ئەو بابەتەی لێرەدا دەیخەمەڕوو، ناوونیشانە گشتییەكەی بریتییە لە "چاو پێداگێڕانەوەیەكی كاری ئیسلامیی"، كە بە عەرەبیی دەبێتە: (مراجعة للعمل الإسلامي).

www.alibapir.net

سەرەتاش دەڵێم:

ئێمە، خوا کە لەم سەر زەمینە دایناوین، ئەرکێکی زۆر گەورەو گرنگی پێ سپاردووین، کە بریتیە لە هەڵگرتنی ئەمانەتی خوا، وەك خوا (سبحانه وتعالى) لە ئایەتی پێش کۆتایی سوورەتی (الأحزاب)دا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّا عَرَضْنَا ٱلْأَمَانَةَ عَلَى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱلْجِبَالِ فَأَبَيْنَ أَن يَحْمِلْنَهَا وَأَشْفَقْنَ مِنْهَا وَحَمَلَهَا ٱلْإِنسَٰنُ ۖ إِنَّهُۥ كَانَ ظَلُومًا جَهُولًا ﴿٧٢﴾ ﴾ (الأحزاب: ٧٢)

خوا (سبحانه وتعالى) ڕایدەگەیەنێ: ئێمە ئەمانەتمان (سپاردەی خۆمانمان) ڕانواند لەسەر ئاسمانەکانو زەویو چیایەکان، کە (هەڵیبگرن و وەئەستۆی بگرن)، ﴿ فَأَبَيْنَ أَن يَحْمِلْنَهَا وَأَشْفَقْنَ مِنْهَا ﴾ ، بەڵام ئامادە نەبوون هەڵیگرنو لێشی ترسان، ﴿ وَحَمَلَهَا ٱلْإِنسَٰنُ ﴾ ، کەچی ئینسان هەڵیگرت، ﴿ إِنَّهُۥ كَانَ ظَلُومًا جَهُولًا ﴾، بە دڵنیایی مرۆڤیش زۆر ستەمکارو، زۆریش نەفامە، واتە: مرۆڤ ئەگەر دەست بە هیدایەتی خواوە نەگرێ، لەڕووی تیۆرییەوە: بەهۆی نەزانییەوە تووشی لادان دەبێ و، لەڕووی کردەییشەوە: بەهۆی ستەمەوە تووشی خلیسکان دەبێ.

www.alibapir.net

کەواتە: دوو سیفەتی خراپ (رذیلة)ی کە لە مرۆڤدا هەن، دەبنە هۆی ئەوە کە ئەمانەتی خوای بۆ هەڵنەگیرێو سپاردەکەی زایە بکات، ئەوانیش بریتین لە: نەزانیی (جهل) و ستەم (ظلم)، بەپێچەوانەشەوە: ئەوەی وا دەکات مرۆڤ بتوانێ ئەمانەتی خوا هەڵبگرێو، جێنشینایەتیی خوا بکات لەسەر زەوی، دژەکانی ئەو دوو (رذیلة)یەن، کە بریتین لە زانیاریی (علم) و دادگەریی(عدل).

کەواتە: بە ئەندازەی ئەوە کە ئینسان ئەهلی عیلم دەبێ، لە رووی تیۆریی‌و فیکرییەوەو، ئەهلی عەدل دەبێ، لەرووی کردەییەوە، شایستەیی ئەوەی دەبێ، ئەمانەتی خوا هەڵبگرێو، ئەو رێزو حورمەتەی خوا لێی ناوەو ئەو پێگەیە کە خوا بۆی داناوە، بیپارێزێ، کە بریتیە لە جێنشینایەتیی کردنی خوای پەروەردگار لەسەر زەوی.

هەڵبەتە بەهۆی وەرگرتنی هیدایەتی خواوە: لێ تێگەیشتنی هیدایەتی خواو، تێدا پێگەیشتنی، ئینسان جەهلەکەی دەگۆڕێ بۆ عیلم، و زوڵمەکەشی دەگۆڕێ بۆ عەدل‌و، سەرەنجام شایستەی ئەوە دەبێ، کە: سپاردەی خوا زایە نەکات و بیپارێزێ‌و هەڵیگرێ.

www.alibapir.net

ئنجا ئێمە لەم سەر زەوییە خوای پەروەردگار دایناوین و پرسی پێ نەکردووین، و پرسیشمان پێ ناکا، لامان دەبات، نە پرس بە (تاك تاك)مان دەکا کە لامان دەبات، نە پرس بە (کۆ)شمان دەکا، کە لامان دەبات، خوای کارزان بەبێ ویستی خۆمان ئێمەی هێناوە بۆ ئێرە، هەر کامێکمان بە تەنیا پرسمان پێ نەکراوە، بەبێ ویستی خۆشمان لامان دەبات، ئنجا هەندێك لەوانەی کە سەریان بۆ ئیلحاد دەخورێ، ئەوە دەکەن بە بیانوو بۆ ئیلحاد، کە: بۆچی خوا پرسی بە ئێمە نەکردوە؟ بۆچی ئێمەی خستۆتە تاقی کردنەوەیەکەوە، کە ڕەنگە لێی دەرنەچین؟ خوا (سبحانە وتعالی) لە سووڕەتی (الکهف) ئایەتی ژمارە (٥١)دا، دەفەرموێ: ﴿ مَّآ أَشۡهَدتُّهُمۡ خَلۡقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَلَا خَلۡقَ أَنفُسِهِمۡ وَمَا كُنتُ مُتَّخِذَ ٱلۡمُضِلِّينَ عَضُدٗا ﴿٥١﴾ ﴾. واتە: ئەوان (مرۆڤ و جین)م ئاگادار نەکردۆتەوە لە دروستکرانی خۆیان‌و، ئاسمانەکان‌و زەویش، یاخود ئامادەم نەکردوون لەو کاتەدا.

﴿ مَّآ أَشۡهَدتُّهُمۡ ﴾[1] یانی: (ما أحضرتهم) ئامادەم نەکردوون، یاخود یان: (ماجعلتهم شهداء) نەمکردوونە شایەدو بینەر.

---

[1] المعجم الوسيط، ص ٤٩٧ .

www.alibapir.net

خوا (سبحانه وتعالى) خوايه، ئيدى كەسێك قەدرو مەقامى خوا بزانىٚ، ئەو قسەيه ناكات، بۆيه من لەو كتێبەمدا كه ئێستا لەژێر چاپە، بەناوى: (درەوشاوەيى ئيمانو پووچەڵيى ئيلحاد) باسم كردوە، كه نه بڕوادارێكى جيددىى ئەو پرسيارە دەكاو، ئەو ڕەخنەيه دەگرىٚ، نه مولحيدێكى جيددييش:

١- بڕوادارى جيددىى كه بەڕاستيى خوا بناسىٚ، له خۆى ناوەشێنێتەوە كه خوا (سبحانه وتعالى) ئەو ڕەخنەيەى ئاڕاستەى خوا بكا، كه هەر شتێكى نامەنتيقييه، چونكه تۆ كه نەبووبى، خوا چۆن پرست پىٚ بكا؟! پاشان كەسێك مەقامى خوا بزانىٚ، كه خوا چەند مەزنه، چەند بەرزە، ئەسڵەن بيرۆكەى وا بەدڵيدا نايەت، بەڵىٚ، خوا ئێمەى هێناوەتەدى، بەبىٚ ويستى خۆمان، چونكه ئێمه دروستكراوى خواين، خواى پەروەردگاريش يەكىٚ له سيفەتەكانى ئەوەيه كه كاربەجىٚ يە، كارزانە، شتى بىٚ جىٚ ناكات.

٢- كەسێكيش مولحيد بىٚ ئەو پرسيارە هەر ناكا، چونكه كەسێك بڕواى به شتێك نەبىٚ چۆن ڕەخنەى لىٚ دەگرىٚ؟!

ameer.maktab@yahoo.com

 /AliBapir  /AliBapir  /MediaAmeerOffice

www.alibapir.net

www.alibapir.net

بەهەرحاڵ ئێمە لەم سەر زەوییەین، بە تەئكید بۆ تاقیكرانەوە، بۆ هەڵگرتنی ئەمانەتی خوا، بۆ جێنشینایەتیی كردنی خوا لەسەر زەوی.

ئێمە وەك خەڵكی مسوڵمان بە گشتی، هەر كەسێك لە ئیسلام تێگەیشتبێ، دەزانێ كە ئەو ئیمانو ئیسلامو هیدایەتە، نیعمەتێكە هیچ نیعمەتێكی دیكەی ناگاتێ، نیعمەتێكە كەلێن و بۆشایی هەموو نیعمەتەكانی دیكە كە نەتبن، پڕیان دەكاتەوە، هەر بۆیە زانایان دەڵێن، لە سووڕەتی (الفاتحة)دا كە ئێمە دەیخوێنین: ﴿ اهْدِنَا الصِّرَاطَ الْمُسْتَقِيمَ ۝٦ صِرَاطَ الَّذِينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ ﴾ (الفاتحة: ٦-٧)، بمانخە سەر ڕێی ڕاست، ڕێی ئەوانەی چاكەت لەگەڵ كردوون.

﴿الَّذِينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ ﴾، خوای میهرەبان لە سووڕەتی (النساء)دا پێناسەی كردوون: ﴿ وَمَن يُطِعِ اللَّهَ وَالرَّسُولَ فَأُولَٰئِكَ مَعَ الَّذِينَ أَنْعَمَ اللَّهُ عَلَيْهِم مِّنَ النَّبِيِّينَ وَالصِّدِّيقِينَ وَالشُّهَدَاءِ وَالصَّالِحِينَ ۚ وَحَسُنَ أُولَٰئِكَ رَفِيقًا ۝٦٩ ﴾ (النساء: ٦٩).

بەڵام بەپێی ئەم ئایەتەش ﴿الَّذِينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ﴾ واتە: ئەوانەی كە خوا هیدایەتی داون بۆ ئیمانو ئیسلام، چونكە بەبێ ئەو

www.alibapir.net

نیعمەتە، نیعمەتەکانی دیکە هەموویان خاوەنەکانیان لەسەریان قەرزدار دەبنەوە، ئەگەر نیعمەتی ماڵو سامانە، ئەگەر دەسەڵاتە، ئەگەر زانستییە، ئەگەر هەرچی هەیە، هەر نیعمەتێك، ئیمانو هیدایەتی خوای لەگەڵدا نەبێ، خاوەنەکەی لێی تووشی زەرەر دەبێ و، لەسەری قەرزداربار دەبێتەوە.

لەنێو مسوڵمانانیشدا ئەوانەی کە خوا (سبحانە وتعالی) هۆشیاری کردوونەوەو، بێداری کردوونەوە: عەقڵی هۆشیار کردوونەوە بە زانستی شەرعیی، بە تێگەیشتن لە دین و، دڵی بێدارکردوونەوە بە ئیمانو تەقوا، ئەوانە بەڕاستیی زۆر زۆر خوا پێداون، کە ئێستا لەم ڕۆژگارەی ئێمەدا ئەوانە وشەی (ئیسلامیی)یان بۆ بەکار دێ - کە دوایی دێمە سەر بەکارهێنانی ئەم وشەیەو بەکارنەهێنانی - گرنگ ئەوەیە وشەی ئیسلامیی، چ بۆ لایەنە ئیسلامییەکان بەکاربێ، چ بۆ عالەمی ئیسلامیی، چ بۆ کەسایەتییەکان، چ بۆ ناوەندەکان، وشەی (ئیسلامیی) بۆ ئەو مسوڵمانە بێدارو هۆشیارانە بەکاردێ، کە دەیانەوێ خۆیانو کۆمەڵگاو دەوروبەریان بە ڕێی خواو پێغەمبەری خوادا ﷺ بەرن.

ئێمە کە لەم ژیانەی سەرزەمین دا لە چوار لاوە حەوجێی ڕێنمایی و هاوکاری خوای میهرەبان و بەخشەرین:

www.alibapir.net

١- خـوای تـاك و پـاك دەفـەرموێ: مـرۆڤ ئـەهلی جەهلـە،و ئـەهلی زوڵمە.

٢- بە تەئكید كەسانێك بیانەوێ بەڕێی خوادا بڕۆن، ئەوانەی كە ناحەزی خوان دژایەتییان دەكەن و لەمپەریان دەخەنە بەردەم.

٣- پاشان مرۆڤ لە زاتی خۆیدا هەواو ئارەزووی هەیە.

٤- شەیتانیش دوژمنێكی هەمیشە لە بۆسەدایە:

ئێمەیەكی ئاوا بە دڵنیایی ئەگەری ئـەوە هەیـە، تووشـی هەڵـەو كەم و كوڕیی و لەبیرچوونەوە،و زەفەر پێ بران، لەلایـەن نـەفس و شـەیتـانـەوە بـبین، هـەروەها تووشـی هەڵـەی فیكریـی و هەڵـەی كردەیـی بـبین، بۆیـە پێویسـتییمان بـەوە هەیـە كـە جـار جـار هەڵوەستە بكەین، چ هەركاممان لە زاتی خۆیـدا، چ وەك كۆمـەڵ، هەڵوەسـتە بكـەین، تەماشـایەكی ڕابـردوو بكـەین و سـەرنجێكی داهاتوو بدەین، بزانین داخۆ ئێمە لەكوێین؟ ئێمـە وەك تـەوژم و وەك لایەنێكی ئیسلامیی: بۆچی دروسـت بـووین؟ ئامانجـەكانمان چین؟ ڕێبازەكەمان چییە؟ لـەكوێی ئـەو ئامانجانـەین، كـە بۆیـان دروست بووین؟ لە كوێ ی ڕێبازەكەمانین؟ لە چ ئاستێك دایـن؟ خێرمان چەندە؟ شەڕمان چەندە؟ بە دڵنیایی پێویستییمان بـەو پرسیار لە خۆكردنانە هەیە.

www.alibapir.net

ئەم بابەتەی کە قسەی لەسەر دەکەم، بۆ جێ بەجێ کردنی بەشێکە لەو ئەرکە، کەمن بە شەخصیی لەسەر شانمە بەرامبەر بە کۆمەڵی ئیسلامیی، بەرامبەر بەو کارو پرۆژەیەی کە کۆمەڵی ئیسلامیی ئەنجامی دەدا، بۆیە ئەو بەڕێزانەی کە سەرکردایەتی ئەم کارو کاروانە دەکەن، کە لە کۆنگرەی ڕابردوودا، کادیران و مشوورخۆرانی کۆمەڵی ئیسلامیی بۆ چوار ساڵ هەڵیانبژاردوون ، هەم خۆم و هەم ئەوانیش، پێویستە پێکەوە چاو بەخۆماندا بگێڕینەوە،و بزانین لە کوێی کاروپرۆژەکەمانین و لەکوێی ئامانجەکانمانین؟

بەڕێزان!

هەر کەس بە ویژدانەوە و بابەتییانە سەرنجی واقیع و حاڵ و باڵی مسوڵمانان بدات، چ لە هەرێمی کوردستان و عێراق و، چ لە هەر ولاتێکی دیکەی دنیادا، دڵنیا دەبێ کە زیندوویێتی ئیسلام و شوێنکەوتووانی - لەم ڕۆژگارەدا - بە زۆریی، پەیوەستە بەو کۆمەڵ و جم و جۆڵە ئیسلامییانەوە، کە لە ژێر ناوونیشانی جیاجیادا، کاردەکەن بۆ بەرز ڕاگرتنی بەیداغی ئیسلام و گێڕانەوەی شکۆو بەها بەرزەکانی و حوکم و ڕێنماییەکانی بۆ سەرجەم کایەکانی، ژیانی تاکیی و خێزانیی و کۆمەلایەتیی و سیاسیی.

www.alibapir.net

هەربۆیەش خەم لێخواردنی تەوژمی هۆشیاریی و بێداریی ئیسلامیی، بە گشتیی و یەك یەكی پێكهاتەكانی بە تایبەت، لە ڕووی بژاركردنی لە كەم و كوڕیی و هەڵە و پەڵەكانی و كاركردن بۆ گەشەپێدانی زیاتر و باشتریەوە، ئەركی سەرشانی هەموو لایەكە.

چونكە بێگومان ئەو كەسە هەڵە ناكات كە هیچ ناكات و، ئەمەش خوازیاری ئەوەیە كە دڵسۆزانی كاروچالاكی ئیسلامیی، بەردەوام سەرگەرمی هەڵوەستەكردن و چاوبەخۆداگێڕانەوە و ڕامان و سەرنج دان بن، لە هەموو ڕوویێكەوە:

هەم لە خۆیان، هەم لە كار و پرۆژەكەیان:

لە خۆیان: لە ڕووی: پەیوەندییانەوە لەگەڵ خواداو، لە ڕووی: بەرچاوڕوونییانەوە لە ئایین و، بەرنامەكەیان و، واقیع و هەل و مەرجی كۆمەڵگاكەیان و، ئەو دنیایەی كە تێیدا دەژین و ... هتدەوە.

لە كارو پرۆژەكەیان: لە ڕووی هەڵە و پەڵە و كەم و كوڕیی و سەركەوتن و شكستەكانی رابردوویانەوە و، لە ڕووی ئامانجە نیزیك و دوورەكان و، ڕێباز و شێواز و ئامرازەكان و، قۆناغ و وێستگەكانی كاریان و ... هتدەوە.

www.alibapir.net

ئەم بەرهەمەی بەردەستیشتان هەوڵ و هەنگاوێکە لەو پێناوەدا و، هیودارم ئەو ئامانجانەی تێیدا ڕەچاوکراون، بیانهێنێتەدی و، چاوەڕێی سەرنج و تێبینی و پێشنیارەکانیشتانم، بۆ زیاتر بەهێزکردنی.

ameer.maktab@yahoo.com

 /AliBapir  /AliBapir  /MediaAmeerOffice

www.alibapir.net

١١ رجب ١٤٤٠ ك

٢٠١٩/٣/١٨ ز

ameer.maktab@yahoo.com

 /AliBapir  /AliBapir  /MediaAmeerOffice

www.alibapir.net

بەڕێزان!

ئەم بەرهەمەی بەردەستتان لە ئەسڵ دا چوار وتار (محاضرة)ی بەندەبووە کە لە خولێك دا پێشکەشی ئەندامانی سەرکردایەتیی کۆمەڵی ئیسلامیی کراون، لە هۆڵی مەڵبەندی سلێمانی، لە رۆژی ٢٤/ ٤/ ١٤٤٤ك بەرانبەر: ٢٠١٨/١٢/٣١ز دا، شایانی باسیشە خول (دورة)ەکە لەلایەن: (ناوەندی ڕاهێنان و گەشەپێدان)ەوە سازکرابوو.

هەروەها کۆی چوار وتارەکەش لەلایەن ناوەندی ناوبراوەوە، تایپ کران و پاش پێداچوونەوەی وردی خۆیشم، ئەرکی هەڵەچنییشیان وەئەستۆگرت، بۆیە پڕ بەدڵ سوپاسییان دەکەم و لە خوای بە بەزەیی و بەخشەریش داواکارم بە باشترین شێوە پاداشتیان بداتەوە و پیتوپێزی زیاتریش بخاتە ئیش و کاریانەوە.

ئەم کتێبەش بە گشتی بۆ پێنج تەوەر دابەش کراوە، بەم ناونیشانانەی خوارێ:

www.alibapir.net

تـــەوەری یەکـــەم: پێناســـەو پێویســـتیی‌و سەرگوزشـــتەی کـــاری ئیسلامیی.

تـــەوەری دووەم: چـــاوبەخۆداگێڕانەوە لەســـەر ئاســـتی: تـــاك‌و کۆمەڵ‌و کۆمەڵگا.

تەوەری سێ یەم: دە (١٠) سەرنج لەبارەی نێومڕۆك‌و چۆنیەتیی کاری ئیسلامییەوە.

تـــەوری چـوارەم: دە (١٠) هۆشـداریی لـەبارەی مامەڵـەوە لەگـەڵ واقیع‌و دەوروبەردا.

تـــەوەری پێنجـــەم: حـــەوت (٧) مەســـەلەی هەســـتیاری کـــاری ئیسلامیی، کە زۆرترین مشت‌ومڕیان لەسەرە لەم ڕۆژگارەدا:

١) بانگەوازو سیاسەت، تێکهەڵکێشن.

٢) بەکارهێنانی هێز بۆ پاکسازیی‌و چاکسازیی، ناڕەوایە.

٣) قۆناغی بانگەوازو قۆناغی دەوڵەت، حوکمیان جیایە.

٤) ئـافرەت‌و پیـاو لـە هـەموو شـتێکدا یەکسـانن، جگـە لـەوەی جیاوازیی سروشتیان دەیخوازێ.

٥) کۆمەڵگایەکە شەریعەت پیادە دەکات.

www.alibapir.net

٦) سزا شەرعییەکان کۆتا حوکمەکانی شەریعەتن، کە پیادە دەکرێن.

٧) بنەما گرنگەکانی کاری ئیسلامیی سەرکەوتوو.

سەرەتاش دەمەوێ ئەوە بڵێم: دوای ئەوەی کە (ناوەندی ڕاهێنان و گەشەپێدان) ئەو پێشنیارەیان کرد، ماوەیەکی زۆرە لێکۆڵینەوەی زۆرم کردوە لەبارەی هەموو ئەو جەم و جۆڵە ئیسلامییانەی لەم ڕۆژگارەدا هەن، هەر لە پاکستانەوە پێدا وەرە، کۆمەڵی ئیسلامیی لەوێ، تا دەگاتە مەغریب، چ دادو گەشەپێدان، چ (العدل و الإحسان)، پاشان جەزائیر، هەروەها یەمەن (التجمع اليمني للإصلاح)، پاشان سوودان، ئنجا تونس (بزووتنەوەی نەهزە)، دوایی میسڕ، هەروەها فەلەستین و (الحماس) و(الجهاد)، دوایی لوبنان (حزب الله)، هەروەها ئێران و تورکیا، ئەوانە هەموویان هەوڵمداوە دیراسەی وردو قووڵیان لەسەر بخوێنمەوە، نەك تەنیا لە سەرچاوەیەك و دوو سەرچاوە، تاکو بزانین هەموو ئەو ئەزموونە ئیسلامییانەی کە لەم ڕۆژگاری ئێمەدا هەن، سەرکەوتنیان تا چەندە؟ شکستیان تا کوێ یە؟ هۆکارەکانی شکستیان چین؟ ئەو سەرکەوتنەی وەدەستیان هێناوە، چۆنەو چۆن بووە؟ مەبەستم ئەوەیە مەسحێکی باشی

www.alibapir.net

ئەو نەخشە سیاسییە ئیسلامییەم كردوە، كە ئەم جموجۆڵو كاروپڕۆژە ئیسلامییانەی لەسەر ئەنجام دەدرێن.

لەگەڵ ئەوەشدا، هەرچی كە لێرە پێتان دەڵێمو دەیخەمە ڕوو، تەنیا وەك تێگەیشتنی خۆمەو هەمووی هەڵهێنجانو تێگەیشتنی منە، ئێوەش، لێی وردبنەوە، هەڵیسەنگێنن و، لە قۆناغەكانی دواتریش دا پێم خۆشە ئەو شتانەی كە من باسیان دەكەم، باش لە تەتەڵەو بێژینگیان بدەین و، هەڵوەستەیان لەبەردەمدا بكەین، چونكە ئەوەی من بۆم دەركەوتوە، زۆربەی جموجۆڵە ئیسلامییەكان لە ئەنجامی كەم تفاقیی[1] لە ڕووی فیكرییەوەو، كەمتر هەڵوەستە كردن، كەمتر لێكۆڵینەوەو، كەمتر داهێنان و تێوەڕامان، تووشی هەڵەو كرچو كاڵیو خلیسكان بوون. خۆشتان دەزانن، برای خۆتان لەو بارەوە زۆر كاری كردوە، بەڵام ئێستاش پێم وایە، پێویستییمان بەكاری زۆر زیاتر هەیە، بەتایبەت بیركردنەوە لەم كاروچالاكیو جموجۆڵەی كە ئەنجامی دەدەین، لەسەرەتاوە ئەوەتان پێ دەڵێم، كە ئەوەی دەیڵێم، ئەو قەناعەتانەیە كە من پێی گەیشتووم، ئەو تێگەیشتنو ئەو هەڵهێنجانەیە كە من لێی حاڵی بووم، بەڵام ناڵێم ئەوە حەقی ڕەها (مطلق)ی تێدایە، بێگومان بەشەر

---

[1] كەم تفاقیی: كەم توانایی.

www.alibapir.net

هەمووی لە حاڵەتی ڕێژەیی (نسبي) دایەو، ڕەها (مطلق) تەنیا لەلای خوای پەروەردگارە.

پێویستە ئەوەش بڵێم:

کە بەگشتی بابەتەکە بە هەر پێنج تەوەرەکەیەوە، وەك خۆی هێڵدراوەتەوەو، دەستکارییەکی ئەوتۆ نەکراوە، بەڵام هەندێك برگە و ڕستە و وشە کە لەگەڵ شێوازی نووسین دا گونجاو نەبوون، گونجێنراون و، ئەو فەرموودە و دەقانەش کە بە بەڵگە هێنراونەوە، تەخریج کراون و، چەند برگەیەکی کەمیش زیادکراون.

ameer.maktab@yahoo.com

 /AliBapir  /AliBapir  /MediaAmeerOffice

www.alibapir.net

www.alibapir.net

تەوەری یەکەم

# پێناسەو پێویستیی و سەرگوزشتەی کاری ئیسلامیی

بەڕێزان!

لە سێ بڕگەدا، ئەم تەوەری یەکەمە دەخەینەڕوو:

## بڕگەی یەکەم: پێناسەی کاری ئیسلامیی:

سێ پێناسەی کورتم هێناون، کە (کاری ئیسلامیی) یانی چی؟

أ) مەبەست لەکاری ئیسلامیی، تێکۆشانی مسوڵمانانە بۆ ئەوەی ژینیان بەپێی دینیان بێ.

ب) مەبەست لە کاری ئیسلامیی، ئەوەیە کە مسوڵمانان ئایینو بەرنامەی خوا، سایەو سێبەریان بێ.

ج) ئامانج لەکاری ئیسلامیی، ئەوەیە، کە ئایینی خوا (سبحانە وتعالى)، کە لە قورئانو سوننەتدا بەرجەستەیە، لە ژیانی تاکیی و خێزانیی و کۆمەڵایەتیی و سیاسیی مسوڵماناندا بەرجەستەو جێ بەجێ ببێ.

www.alibapir.net

با تەماشای ئەم چەند ئایەتە موبارەکە بکەین:

١) سێ ئایەت لە سورەتی (الأنعام): (١٦١ – ١٦٣): ﴿ قُلْ إِنَّنِي هَدَانِي رَبِّي إِلَىٰ صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ دِينًا قِيَمًا مِّلَّةَ إِبْرَاهِيمَ حَنِيفًا ۚ وَمَا كَانَ مِنَ الْمُشْرِكِينَ ﴿١٦١﴾ قُلْ إِنَّ صَلَاتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ ﴿١٦٢﴾ لَا شَرِيكَ لَهُ ۖ وَبِذَٰلِكَ أُمِرْتُ وَأَنَا أَوَّلُ الْمُسْلِمِينَ ﴿١٦٣﴾ ﴾ .

سوورەتی (الأنعام)، سوورەتی خوابەیەکگرتن (التوحید)ە، بە ئیمتیاز، چل‌و دوو (٤٢) جار خوا (سبحانە وتعالی) لە سوورەتی (الأنعام)دا بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿قُلْ﴾ بفەرموو، زۆربەی ئەو جارانەش لەبارەی ئیمان و خوابەیەکگرتنەوەن، خوا (سبحانە وتعالی) لە کۆتایی سوورەتی (الأنعام)دا، بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿ قُلْ إِنَّنِي هَدَانِي رَبِّي إِلَىٰ صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴾، بەڵێ بەدڵنیاییەوە من پەروەردگارم خستوومیە سەر ڕاستە شەقام، ﴿ دِينًا قِيَمًا مِّلَّةَ إِبْرَاهِيمَ حَنِيفًا ﴾{، (قِيَمًا ) و (قيِّما) هەر یەکن}، دینێکی ڕێك‌و ڕاست، یاخود دینێکی مشوورخۆرو سەرپەرشتیارە، هەمان ڕێبازی (إبراهیم)ە، {(ملة) هەر بە مانای دینە، بەڵام (دین) پاڵ دەدرێتە لای خوا، (ملة)

www.alibapir.net

پاڵدەدرێتە لای مرۆڤ} . ﴿مِّلَّةَ إِبْرَٰهِيمَ﴾، یانی: هەمان ئەو ڕێبازەی کە (إبراهیم) لەسەری بووە، ﴿حَنِيفًاۚ﴾، ئایینەکە: پاكو بێ خلّتە بووە، یان: ئیبراهیم دینداریّکی ڕاستو ساغ بوو، ﴿وَمَا كَانَ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ﴾، ئیبراهیم لە هاوبەش بۆ خوادانەران نەبووە.

ئنجا ئایا ئەو ڕاستە شەقامە چییە؟ ئەو دینە ڕێكو ڕاستە چییە؟ ﴿ قُلْ إِنَّ صَلَاتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾، بڵێ: من نوێژمو قوربانیی سەربڕینمو خواپەرستییەکانی حەجمو، و ژیانو مردنم، بۆ خوای پەروەردگاری جیهانەکانە.

ئا ئەوە ئایینی ڕاستو ساغە، کە ئینسان هەموو شتێکی بۆ خوا بێو، هەموو شتێکی بەپێی شەرعیی خوا بێ.

دوایی دەفەرموێ: ﴿ وَبِذَٰلِكَ أُمِرْتُ وَأَنَا۠ أَوَّلُ ٱلْمُسْلِمِينَ ﴾. تەنیا بەوە فەرمان پێکراوەو، من یەکەمی مسوڵمانانم، یەکەمی هەموو ئەو کەسانەم کە بۆ خوا ملکەچن.

٢) لە سوورەتی (الجاثية) ئایەتی (١٨): ﴿ ثُمَّ جَعَلْنَٰكَ عَلَىٰ شَرِيعَةٍ مِّنَ ٱلْأَمْرِ فَٱتَّبِعْهَا وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَآءَ ٱلَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ ﴿١٨﴾ ﴾، واتە:

www.alibapir.net

(لەدوای ئەزموونی خاوەن کتێبەکان، چونکە پێشێ باسی جوولەکەو نەصرانییەکان دەکات) لەدوای ئەوان تۆمان خستە سەر ڕێبازێك لە ئایینی خۆمان، شوێنی بکەوەو، شوێن ئارەزووی ئەوانە مەکەوە کە نازانن.

٣) لە سوورەتی (الشوری) ئایەتی (١٣): ﴿ شَرَعَ لَكُم مِّنَ ٱلدِّينِ مَا وَصَّىٰ بِهِۦ نُوحًا وَٱلَّذِىٓ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ وَمَا وَصَّيْنَا بِهِۦٓ إِبْرَٰهِيمَ وَمُوسَىٰ وَعِيسَىٰٓ أَنْ أَقِيمُوا۟ ٱلدِّينَ وَلَا تَتَفَرَّقُوا۟ فِيهِ ... ﴾ ، واتە: (خوا) لە ئایین بەرنامەیەکی بۆ داناون، هەمان بەرنامە کە (نووح)ی پێ ڕاسپاردبوو، هەروەها ئەوەی کە وەحییمان کردبوو بۆ تۆو بۆ ئیبڕاهیم‌و مووساو عیسا، پێمان ڕاگەیاندن، کە ئایینی خوا بەرپابکەن‌و تێیدا پەرتەوازە مەبن...

کەواتە: کاری ئیسلامیی چییە؟ کاری ئیسلامیی‌و مشوورخۆریی مسوڵمانان بۆ ئایینەکەیان، ئەوەیە: کە بەشێوەیەك بژین کە دینیان لێیان دەخوازێ و، کاری ئیسلامیی بۆ ئەوەیە کە مسوڵمانان ژیانیان بە وردو درشتیەوە، بە هەموو ڕەهەندەکانیەوە، بەو شێوەیە بڕۆیشترێ، کە وەحیی خوای پەروەردگار فەرمانیان پێ دەکا.

www.alibapir.net

سێ ڕاستیی گەورەو گرنگ:

لێرەدا دەبێ سێ ڕاستیی ڕوون بکرێنەوە، لە بواری پێناسەی کاروچالاکیی ئیسلامیی دا:

<u>ڕاستیی یەکەم</u>: ئایا کاری ئیسلامیی پێویستەو، مەرجە کە حەتمەن دەبێ لە ڕێکخراوێکی سیاسییدا بەرجەستە ببێ؟ بەو شێوەیە کە ئێستا هەیە؟ من پێم وایە نەخێر، مەرج نیە، بەڵام ئەوە شێوازێك لە شێوازەکانە، ئەگەرنا پێشەوایانی ئێمە، بۆ وێنە: پیاوانێکی وەك: (شێخ عبدالقادری گەیلانیی)، (ئەبو حامیدی غەززالیی)، (ئیبنو تەیمییە)و، زانایانی دیکە، ئەوانە نەچوون وەك بەم شێوەیەی ئێستا باوە، ڕێکخراوێکی سیاسیی دروست بکەن، کە گۆڕانکاریی لە کۆمەڵگادا بکەن، بەڵکو هەر کامیان بەو شێوەیەی کە بۆخۆی لە ڕۆژگاری خۆیدا بە گونجاوی زانیوە، کاری خۆی کردوەو جەختیشی لەسەر ئەو لایەنە کردوە، کە بە پێویستتری زانیوە.

کەواتە: لە ڕۆژگاری ئێستای ئێمەدا، یەکێك لە شێوازەکانی کاری ئیسلامیی ئەوەیە، ڕێکخراوی سیاسیی بێ، ئەگەرنا دەگونجێ ڕێکخراوێکی مەدەنیی بێ، دەگونجێ تەوژمێکی گشتی (تیّار عام) بێ، دەگونجێ تەریقەتێك بێ، بەو شێوەیە کە کاتی خۆی

www.alibapir.net

ڕێبازەکانی تەزکیە هەبوون، دەگونجێ کەسایەتییەك هەبێ‌و هیچ ناوێك لە کارەکەی نەنێ، وەك واقیعی ئێستا کە بێگومان هەموو ئەمانەش هەر هەن، بەڵام ئایا بە کام لە شێوازەکان دەگونجێ کە زیاتر گۆڕانکاریی بکەین‌و، گۆڕانکارییەکی گشتگیر بکەین، لە ڕووی سیاسیی، ئابووریی، کۆمەڵایەتیی، فیکریی؟ بێگومان بە کاری ڕێکخراوی سیاسیی، وەك ئێستا باوە.

ئەوە ڕاستیی یەکەمیان، کە دەتوانین ئەم ئایەتەی بە بەڵگە بۆ بێنینەوە، کە خوا لە سووڕەتی (العنکبوت) ئایەتی (٦٩)دا، دەفەرموێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ جَٰهَدُواْ فِينَا لَنَهۡدِيَنَّهُمۡ سُبُلَنَاۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَمَعَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ٦٩ ﴾ واتە: بێگومان ئەوانەی لە پێناوی ئێمەدا تێدەکۆشن، ڕێبازەکانی خۆمانیان پێشان دەدەین‌و، مسۆگەر خوا لەگەڵ چاکەکاران دایە.

کە ئێرە تاکە شوێنە وشەی (سبل) پاڵدرابێتە لای خوا، ئەگەرنا هەر (سبیل الله)، (سبیل ربك)، (سبیلنا) هاتوە، بەڵام لێرە (سُبُل)، هاتووە، چونکە باس باسی تێکۆشانە لە پێناوی خواداو، تێکۆشانیش لە پێناوی خوادا، ڕێبازو شێواز و ئامرازی جۆراو جۆر دەخوازێ، هەر یەك ڕێ نیە، یەك باریکە ڕێ نیە، وەك هەندێ وا بانگەشەی دەکەن، ئیللا دەبێ بەو باریکە ڕێیەدا

www.alibapir.net

بــڕۆی، نــەخێر، بــەڵکو وەك ئــەهلی تەســەووف گووتوویانــەو لەوبارەوە قسەیەکی جوانیان هەیە: (الطرق إلى الله بعـدد أنفـاس الخلائــق)، واتــە: ڕێیــەکان بــەرەو خــوا بــە ژمــارەی هەناســەی دروســتکراوەکانن. ڕێ بــەو واتایــە نــا وەك شــەریعەت، چــونکە شەریعەت هەر یەك شەریعەتە، قورئانو سوننەتەو تەواو، بـەڵام شـێوازەکانو ئامرازەکـانو ڕێبازەکـان، کـە دەگیرێنەبـەر، جـۆراو جۆرن، بەپێی جـۆراو جـۆری، ئـەو گۆڕانکارییانـەی کـە دەبـن لـە ژینگەو کۆمەڵگاکانو هەلو مەرجەکاندا.

راستیی دووەم: ئەوەیـە کـە مـەرج نیـە کـارو پـڕۆژەو جموجـۆڵی ئیســلامیی، هەمیشــە هــەموو لایــەنو ڕەهەنــدەکانی ئیســلام بگرێتەوە:

بێگومان ئیسـلام: بوونناسـیی‌و ئیمـانو عەقیدەیـەو، عیبادەتـەو، سیاسەتەو، حیکمەتـەو، مزگەوتـەو، ...هتـد، ئیسـلام کـاڵای بـاڵای مرۆڤە، لە ڕووی تاکیی‌و خێزانیـی‌و کۆمەڵایەتییـەوە، بـەڵام ئایـا مـەرجە کاری ئیسلامیی، جموجۆڵی ئیسلامیی، هەمیشـە هـەموو شـتەکان بگرێتـەوە؟ نـەخێر مـەرج نیـە، ئەگـەر سـەرنج بـدەین: پێشــەوایانی ئێمــەش لــە ڕابــردوودا هــەروایان کــردووەو دوایــی جموجۆڵە ئیسلامییەکانی ئێستاش، هەیانە زیاتر تەرکیز لەسـەر لایەنێك، دوو لایەن، سێ لایـەن، چـەند لایـەنێك دەکـات، چـونکە

کاتێـك دەتـوانی هـەموو لایەنـەكانی، كـە ئیسـلام دەیـەوێن، بیانگریـەوە، كـە دەسـەڵاتت هـەبێ، قـەوارەی سیاسییت هـەبێت، ئـەوكاتیش ڕەنگـە تـۆ هـەر دەسـتكراوە نـەبی، هـەموو یاساكانی ئیسلام جێ بـەجێ بكـەی، بەبەڵگـەی ئـەوە كـە عومـەری كوڕی خـەتتاب (خـوا لێـی ڕازی بێـت)، جێنشـینی دووەمـی پێغەمبـەر ﷺ، دەسـەڵاتێكی باشـی هـەبووە، دەوڵـەتی ئیسـلامیی زۆر دەستڕۆیشتوو بووە، بەڵام هەموومان دەزانـین كـە چـەند جارێـك چـەند حـوكمێكی شـەرعیی، كـە هەلومـەرجی جێبـەجێكردنیان نەڕەخساوە، جێبەجێی نـەكردوون. ئنجا ئەوانـەی كـە ناحـەزن، هەندێك لە (شیعەی رافضة) ناحەزی (عومەر)ن (خوا لێـی ڕازی بێ)، دەڵێن: عومەر ئـەو حوكمانـەی شـەریعەتی پـەك خسـتوون، تـەعـطیلی كـردوون! نـا، بـەڵام عومـەر (خـوا لێـی ڕازی بـێ) زانیویەتی كە زەمینەی جێ بەجێ كردنیان ڕەخساو نیە، ئەگـەر مەسـەلەی بڕینـی دەسـتی دزە، لـە سـاڵی برسـییەتی (عـام المجاعـة)دا، ئەگـەر پێنـەدانی پشـكو بەشـی دڵـڕاگیراوان (مؤلفـة القلـوب)ە، هـەروەها چـەند شـتێكی دیكـە، لەبـەر ئـەوەی كـە زەمینەیان نەڕەخساوە.

www.alibapir.net

کەواتە ئەوەش ڕاستییەکی دیکەیە، کە کاری ئیسلامیی، مەرج نیە هەمیشە هەموو بوارو ڕەهەندەکانی دینداریی‌و دنیاداریی بگرێتەوە.

<u>ڕاستیی سێیەم</u>: لێرەشەوە دەگەینە ئەو ڕاستییە، کە لە دوای پێغەمبەر ﷺ ، هیچ کەس یەکسان نیە بە ئیسلامو، لە دوای هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەر ﷺ، هیچ کەس یەکسان نیە بە هەموو مسوڵمانان، یانی چی؟! پێغەمبەری خوا ﷺ هەر کەسێ بڕوای پێ نەهێنابا و لە خزمەتیدا نەبووایە، بە مسوڵمان لە قەڵەم نەدەدرا، بەڵام لەدوای ئەو کەس وانیە، سەعدی کوڕی عوبادە (خوا لێی ڕازی بێ) بەیعەتی بە (ئەبووبەکر) خوا لێی ڕازی بێ، نەکرد، بەیعەتی بە (عومەر)یش خوا لێی ڕازی بێ، نەکرد، بێگومان دژیان نەبوو، بەڵام بەیعەتی پێیان نەدا، واتە بە حوکمڕانی خۆی لە قەڵەمی نەدان، کەسیش نەیگوت: ئیسلامەتییت نەماوە، بەڵام ئەگەر بەیعەتی بە پێغەمبەر ﷺ نەدابایە، چی دەبوو؟ بێگومان بە مسوڵمان لە قەڵەم نەدەدرا.

لەدوای هاوەڵانیش (خوا لێیان ڕازی بێ) مسوڵمانەتیی لە هیچ کەسێکدا کورت هەڵنەهاتوە، لەسەردەمی پێغەمبەردا ﷺ بەس هاوەڵان مسوڵمان بوون، بە پیاو و ئافرەتەوە، هەر کەسی دیکە، جیا لە هاوەڵان، ئەوەی لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ نەبووبایەو،

www.alibapir.net

لە نێو هاوەڵاندا نەبووایە، بە مسوڵمان لە قەڵەم نەدەدرا، مەبەستم لەو کەسە نیە کە دووری جوگرافیی بووبێ‌و، مسوڵمان بووبێ‌و نەگەیشتبێتە ئەوان، بەڵام مەبەستم ئەوەیە مسوڵمانەتیی لەواندا قۆرخ بووبوو، بەڵام بێگومان دوای ئەصحاب (خوا لێیان ڕازی بێ)، مسوڵمانەتیی لە هیچ گرووپ‌و کۆمەڵێکی مسوڵماناندا کورت هەڵنەهاتوە، ئەوە زۆر گرنگە ئێمە بیزانین، ئنجا ئیدی یەکێك ناو لە خۆی دەنێت (الجماعة الأم)، ئەوی دیکە بڵێ: تەنیا من (کۆمەڵی مسوڵمانان)م، ... هتد، ئەوە هیچی وانیە، عاقڵ ئەو کەسەیە بڵێ: منیش مسوڵمانم: ﴿ وَمَنْ أَحْسَنُ قَوْلًا مِّمَّن دَعَآ إِلَى ٱللَّهِ وَعَمِلَ صَٰلِحًا وَقَالَ إِنَّنِى مِنَ ٱلْمُسْلِمِينَ ﴿٣٣﴾ ﴾ فصلت: ٣٣، واتە: قسەی کێ چاکترە لە هی کەسێك، کە بانگ بۆ لای خوا دەکا، کردەوەی باشیش دەکاو، دەڵێ من لە مسوڵمانانم!

بەڵێ، من لە مسوڵمانانم‌و بەشێکم لە مسوڵمانان.

ameer.maktab@yahoo.com

 /AliBapir  /AliBapir  /MediaAmeerOffice

www.alibapir.net

www.alibapir.net

**بڕگەی دووەم: پێویستیی کاری ئیسلامیی:**

کاری ئیسلامیی بۆچی پێویستە؟ سەرەتا پێویستە بڵێم: ئێمە پەکمان لەسەر ئەوە نەکەوتوە، بەڵگە لەسەر ئەوە بێنینەوە کە کار بۆ ئیسلام بکەین، کار بۆ ئیسلام کردن واتە: هەوڵ بدەین ئەو ئیسلامە، کە خوا ناردوویەتیو لە قورئانو سوننەتدا بەرجەستەیە، لە ژیانی خۆماندا پیادەی بکەین، پەکمان لەسەر ئەوە نەکەوتوە، بەڵگەی سەربەخۆو جیاوازی بۆ بێنین، لەبەرچی؟ لەبەر ئەوەی بەڕێوە چوون بەپێی ئایین، فەرزەو بەبێ بەڕێوەچوون بەپێی ئایین، دینداریی‌و خواپەرستیی ناکرێ، خواپەرستیی، یانی چی؟ دینداریی یانی چی؟ مسوڵمانەتیی، یانی چی؟ یانی بەڕێوەچوون بەپێی ئیسلام.

ئنجا پێغەمبەری خاتەم ﷺ هەر وای کردوە: ئەو ئیسلامەی کە بۆی هاتوە، لە ژیانی خۆیدا بەرجەستەی کردوە و، خەڵکی بۆ بانگ کردوە، پێشێ لە کۆمەڵێکدا، دوایی لە کۆمەڵگایەکدا، دوایی لە قەوارەیەکی سیاسییدا، بەرجەستەی کردوە، پێغەمبەر ﷺ وای کردوە، خوای پەروەردگاریش ئێمەی مولزەم کردوە کە بەدوای پێغەمبەر ﷺ بکەوین: ﴿ لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ ﴾ (الأحزاب: ٢١)، هەموو پێغەمبەرانیش (علیهم

www.alibapir.net

الصلاة والسلام) وایان کردوه، ئەو وەحییەی کە خوا بۆی ناردوون، ئەو شەریعەتەی خوا بۆی ناردوون، هەوڵیانداوە لە ژیانی تاکیی‌و خێزانیی‌و کۆمەڵایەتیی خۆیاندا، بەرجەستەی بکەن، هەروەها هەوڵیش بدەن قەوارەی سیاسیشیی بۆ دروست بکەن، ئنجا چەند دەستیان گەیشتبێتێ و نەگەیشتبێ، گرنگ ئەوە هەموویان وایان کردوە، بەبێ هەلاواردن.

کەواتە: مسوڵمانەتیی، بەبێ مشوورخۆریی، بەبێ هەوڵدان بۆ ئەوەی کە ژینی خۆت‌و دەوروبەرەکەت، بەپێی دینت بێ، مەعنایەکی نامێنێ، لێرەشدا مەبەستم ئەوە نیە بڵێم: هەرکەسێك کاری نەکرد بۆ ئیسلام و، مشووری نەخواردو کاری ئیسلامیی نەکرد، بەو چەمك‌و واتایەی کە ئێستا باوە، مسوڵمان نیە! بەڵکو مەبەستم ئەوەیە بڵێم: پێویست ناکات بەڵگە بۆ سەلماندنی پێویستبوونی کاروچالاکی ئیسلامیی بێنینەوە، من دوایی حەوت (٧) بەڵگە دێنمەوە، بەلام پەکمان لەسەر ئەوە نەکەوتوە، چونکە هەر کاری ئیسلامیی خۆی، یانی: ژیان بەڕێ کردن بەپێی ئیسلام، کە بەشێك لە ژیانەکە، ژیانی تاکیی خۆتە، ئنجا ژیانی خێزانیی، ئنجا ژیانی کۆمەڵایەتیی، کە خۆت مولزەمی بەوەی دەوروبەرت، ئەوانەی کە لەنێویاندا دەژی، بانگیان بکەی بۆ ئەو هیدایەتەی کە خۆت لێی بەهرەمەندی،

www.alibapir.net

بەلام بۆ زیّدە دلّنیایی، با تەماشای ئەم حەوت بەلّگانەش بکەین:

یەکەم: سوورەتی (العصر)، کە سیّ (٣) ئایەتی موبارەکەو، ئەمە دەقەکەیەتی: ﴿بسم الله الرحمن الرحم، وَٱلْعَصْرِ ۝١ إِنَّ ٱلْإِنسَٰنَ لَفِى خُسْرٍ ۝٢ إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَتَوَاصَوْا۟ بِٱلْحَقِّ وَتَوَاصَوْا۟ بِٱلصَّبْرِ ۝٣﴾، واتە: بەناوی خوای بەبەزەیی بەخشندە، سویّند بە عەصر، مرۆڤ هەمووی لە زیانباریی دایە، جگە لەوانەی ئیمانیان هیّناوەو، کردەوە باشەکان دەکەنو، یەکدی ڕادەسپیّرن بە حەق و، یەکدی ڕادەسپیّرن بە خۆڕاگریی.

کەواتە: ئیمانو کردەوەی باش، نیوەی مسولّمانەتییە، نیوەی هۆکاری دەربازبوونە لە زیانبارییو، خەلّك ڕاسپاردن بە حەقو، خۆ لەسەر ڕاگرتنیشی، ئەویش یەکسانە بە نیوەکەی دیکەی.

کەواتە: بەبیّ ئەوە کە مرۆڤ خەلّك ڕاسپیّریّ بەو حەقەی کە بۆخۆی پیّی گەیشتوە، کە لە ئیمانو کردەوەی باشدا بەرجەستەیە، بەبیّ ئەوە، نیوە مسولّمانە، چونکە خوای پەروەردگار چوار (٤) مەرجی داناون، تاکو مرۆڤ لە زیانباریی

www.alibapir.net

دەربازی ببێ: ١- ئیمانو ٢- کردەوەی باشو ٣- ڕاسپاردنی خەڵك بە حەق، ٤- ڕاسپاردنیان بە خۆڕاگریی.

دووەم: بەڵگەیەکی دیکە ئەوەیە: خوا پێغەمبەری خاتەمی ﷺ مولزەم کردوە کە پەیامی خوا بگەیەنێ: ﴿ قُلْ أَيُّ شَيْءٍ أَكْبَرُ شَهَٰدَةً ۖ قُلِ ٱللَّهُ ۖ شَهِيدٌۢ بَيْنِى وَبَيْنَكُمْ ۚ وَأُوحِىَ إِلَىَّ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانُ لِأُنذِرَكُم بِهِۦ وَمَنۢ بَلَغَ ﴾ (الأنعام: ١٩). واتە: بڵێ: چ شتێك شایەدییدانەکەی گەورەترە؟ بڵێ خوا لە نێوان من و ئێوەدا شایەدە و، ئەم قورئانەم بۆ سروش کراوە، تاکو ئێوەی پێ بترسێنم و، هەر کەسێکیش کە پێی دەگات.

پێغەمبەریش ﷺ فەرموویەتی: (بلغوا عني ولو آية) رواه البخاري: ١٢٧٥. واتە: ئەگەر ئایەتێکیش بووە لە منەوە بیگەیەنن.

کەواتە: وەك چۆن پێغەمبەری خوا ﷺ مولزەم کراوە، پەیامی خوا بگەیەنێ، ئێمەش مولزەم کراوین کە پەیامی خوا بگەیەنین، هەم بەدەقی ئەم ئایەتە موبارەکە: (ومن بلغ) هەرکەس پێشی گەیشتوە، مولزەمە بیگەیەنێ، هەروەها پێغەمبەریش ﷺ فەرموویەتی: (بلغوا عني ولو آية).

www.alibapir.net

سێیەم: ئێمە لەسەرمان پێویستە بەدوای پێغەمبەری خوا ﷺ بکەوین‌و، بەبێ ئەوە نابینە مسوڵمان: ﴿ قُلۡ إِن كُنتُمۡ تُحِبُّونَ ٱللَّهَ فَٱتَّبِعُونِي يُحۡبِبۡكُمُ ٱللَّهُ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡۚ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٣١﴾ قُلۡ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَۖ فَإِن تَوَلَّوۡاْ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴿٣٢﴾ ﴾ آل عمران: ٣١ - ٣٢. واتە: بڵێ: ئەگەر خواتان خۆش دەوێ، شوێنم بکەون، خواش خۆشی دەوێن، لە گوناهەکانیشتان دەبووریٚ‌و، خوا لێبوردەی میهرەبانە. بڵێ فەرمانبەریی خواو پێغەمبەر بکەن، ئنجا ئەگەر لامل بوون (پشتیان هەڵکرد) بەدڵنیایی خوا کافرانی خۆشناوێن.

شوێن کەوتنی پێغەمبەر ﷺ هەم لە دینداریيە شەخسییەکەی دا، هەم لە دینداریی کۆمەڵایەتیی دا، هەم لە جەنگ‌و جیهادیی دا، لە بانگەوازکردنی دا، لە پەروەردەکردنی خەڵکی دا... هتد، لەسەر هەموو مسوڵمانان فەرزە.

چوارەم: بەڵگەیەکی دیکە، ئەوەیە کە ئێمە لەسەرمان پێویستە ئەو خێرەی کە خۆمان پێی گەیشتووین، کە هیدایەتی خوایە، ئەو بەهرەمەندبوونەی لەلامانە، خەڵکی دیکەشی لێ بەهرەمەند بکەین، خوا دەفەرموێ: ﴿ كُنتُمۡ خَيۡرَ أُمَّةٍ أُخۡرِجَتۡ لِلنَّاسِ تَأۡمُرُونَ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَتَنۡهَوۡنَ عَنِ ٱلۡمُنكَرِ وَتُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِۗ وَلَوۡ ءَامَنَ

www.alibapir.net

أَهْلُ ٱلْكِتَـٰبِ لَكَانَ خَيْرًا لَّهُم ۚ مِّنْهُمُ ٱلْمُؤْمِنُونَ وَأَكْثَرُهُمُ ٱلْفَـٰسِقُونَ ﴿١١٠﴾ ﴾ آل عمران: ١١٠.

واتـه: ئێـوه باشـترین كۆمـەڵن بـۆ مرۆڤایـەتیی پەیـداكراون، كـە فەرمانیان پێ دەكەن بە چاكە، ڕێگرییـان لێ دەكـەن لـە خراپـەو ئیمان بەخوا دێنن...

كەواتە: ئێمە لەسەرمان پێویستە، ئێمـە وەك ئـەهلی ئیسـلام بـە گشتی، وەك ئوممەتی پێغەمبەر (محمد) ﷺ مـولزەمین كـە ئـەو خێرو بەرەكەتەی پێیگەیشتووین، بە مرۆڤایەتیی بگەیەنین.

پێنجەم: پاشان ئێمە بەرپرسیارین بەرامبەر بە كۆمەڵگاو دەوروبەری خۆمان، خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَـٰكُمْ أُمَّةً وَسَطًا لِّتَكُونُوا۟ شُهَدَآءَ عَلَى ٱلنَّاسِ ﴾ البقرة: ١٤٣، واتە: بەو شێوەیە ئێوەمان گێڕاوە بەباشترین كۆمەڵ، تاكو چاودێربن، یان شایەدو بەڵگە (ی ڕاستیی ئیسلام)بن، بەسەر خەڵكەوە.

پێغەمبـەریش ﷺ دەفـەرموێ: (كلكـم راعٍ وكُلُكـم مَسْؤول عَـنْ رعيته) (رواه البخاري: ٨٩٣، و مسلم: ١٨٢٩). واتـە: هـەر كامێكتـان چاودێرە و بەرپرسیاریشە بەرانبەر بە كۆمەڵگایەكەی.

www.alibapir.net

شەشەم: بەڵگەیەکی دیکە ئەوەیە کە ئێمە بەبێ کارکردن بۆ ئیسلام، حیکمەتی بوونمان نایەتە دی، کە بەندایەتییە بۆ خوا، چونکە بەشێك لە بەندایەتیی بۆ خوا، ئەوەیە کە ئاییینی خوا لەسەر زەوی بچەسپێنی، ئاییینی خوا لە ژیانی خۆتدا، لە وڵاتی خۆتدا بەرێوە بەری، بەبێ ئەوە حیکمەتێك کە خوا ئێمەی بۆ ئەوە هێناوەتەدی، نایەتەدی: ﴿ وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ﴿٥٦﴾ ﴾ (الذاريات: ٥٦). واتە: جینن‌و مرۆڤم تەنیا بۆ ئەوە دروستکردووون، بپمپەرستن.

حەوتەم: کۆتا بەڵگە لەو بارەوە بریتیە لە: پاراستنی ئەو رێزو پایەو پێگەیەی کە خوا پێی داوین: ﴿وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِيٓ ءَادَمَ ﴾ (الإسراء: ٧٠) ، واتە: بەدڵنیایی رێزمان لە وەچەی ئادەم گرتوە... مرۆڤەکان بۆیە بەرێزن، کە بەو شێوەیە لەسەر زەوی بەرێوە بچن، کە خوای پەروەردگار پێی خۆشە، بەڵێ خوای دادگەر بە گشتی رێزی لە مرۆڤەکان گرتوە، بەڵام کام لە مرۆڤەکان ئەو رێزەی کە خوا پێی داون، لە خۆیان دا دەیپارێزن؟ بێگومان ئەوانەی کە شوێن شەریعەتی خوا دەکەون، بە بەڵگەی ئەوە، کە دوایی خوای پەروەردگار باسی هەندێکیان دەکا، کە دەفەرموێ: ﴿ لَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ فِيٓ أَحْسَنِ تَقْوِيمٍ ﴿٤﴾ ثُمَّ

www.alibapir.net

رَدَدْنَٰهُ أَسْفَلَ سَٰفِلِينَ ﴿٥﴾ ﴾ التين: ٤ - ٥. واتە: بە دڵنیایی مرۆڤمان لە باشترین شێوە و پێگەدا دروستکردوە. و دوایی گێڕامانەوە (پلەی) ژێری ژێرەوە. پێشیٚ مرۆڤ لە ﴿أَحْسَنِ تَقْوِيمٍ﴾ دایە، کە خوا ڕێزی لێناوەو، حورمەتی گرتوەو، کردوویەتی بە جێنشینی خۆی، بەڵام تەنیا بە دەست گرتن بە هیدایەتی خواو، شەریعەتی خواوە، ئەو ڕێزو حورمەتە لە خۆیدا دەپارێزێ، لەنێوان خۆیو خوادا[١]، ئەگەرنا دوایی شۆڕدەبێتەوە بۆ خواری خوارێ، لێرەدا مەبەستم ئەوە نیە، کە ئێمە بێ بڕوابوونی هەندێك لە مرۆڤەکان، یان خەڵك بکەینە بەڵگەی ئەوە کە بێ ڕێزو بێ حورمەتن، نا، لە مامەڵەی دنیاییدا مرۆڤەکان هەموویان بەڕێزن، بەڵام بە نسبەت لای خواوەو لە تەرازووی خوادا، هەر تا ئەو کاتە ئەو ڕێزو حورمەتە دەمێنێتەوە، کەمرۆڤ دەست گرتووبێ بە شەریعەتو بەرنامەی خواوە.

لێرەدا پێش ئەوەی بچمە سەر برگەی سێیەمی ئەم تەوەری یەکەمە، دەمەوێ ئاماژە بە بیرۆکەیەك بکەم، ئەویش ئەو بیرۆکەیەیە کە نیشانەی پرسیار دەخاتە سەر کاری ئیسلامیی،

[١] بەڵام وەك مامەڵەی نێوان مرۆڤەکان خۆیان، پێویستە ئەو ڕێزو حورمەتەی یەکدی هەربپارێزن و، هیچ شتێك نەکەنە بیانوو و پاساوی ڕەچاونەکردنی.

www.alibapir.net

کۆمەڵبوونی مسوڵمانان، ڕێکخراوی سیاسیی، ئەو بیرۆکەیە، ئینسان دەبێ بە ئینسافەوە قسە بکا، پێم وایە: بەشێکی پەیوەندیی بە بێ ئاگایی‌و نەزانییەوە هەیە، بەشێکی کەمی، بەڵام پێم وایە بەشی زیاتری ڕەواج پێدانی ئەو بیرۆکەیە، لەلایەن ئەو حوکمە میراتیی‌و بنەماڵەیی‌و خۆسەپێنانەوەیە بەنسبەت ئەوانەوە، کە خۆیان بە مسوڵمان دەزانن، هەروەها لەلایەن ئەو ڕژێم‌و حیزبە سیکۆلاریزمانەوەیە، کە دەزانن ئەگەر مسوڵمانان هۆشیارو بێدار بن‌و، لە ئایینەکەیان تێ بگەن، بێگومان ئەوان بازاڕیان دەشکێ، ئێستا ئەو حیزبە عەلمانییانەی کە لە جیهانی ئیسلامیی دان و، ئەو ڕژێمە عەلمانییانەی کە لە جیهانی ئیسلامیی دا هەن، تاکو کەی خەڵك بەدوایان دەکەوێ؟ تاکو ئەو کاتەی لە ئیسلام تێ دەگات، تا ئەو کاتەی هۆشیار دەبێتەوە، کە دینەکەی چی لێ دەوێ؟ تا ئەو کاتەی حاڵی دەبێ ئەو ئایینە، ئەو شەریعەتەی خوا، تەنیا بەوە ڕازی نابێ، نوێژی بۆ بکات و ڕۆژووی بۆ بگرێ، زەکات بدات،و حەج‌و عومرە، ئەنجام بدات، بەڵکو لێی داوا دەکا، کە لە کۆی هەڵسوکەوتەکانی ژیانی سیاسیی‌و ئابووریی‌و کۆمەڵایەتییدا، پابەند بێ بە شەریعەتەوە، کاتێك مسوڵمانان ئەو تێگەیشتنەیان بۆ دروست دەبێ، بازاڕی ڕژێم‌و حیزبە عەلمانییەکان دەشکێ‌و، خەڵك لێیان کۆنابێتەوە!

www.alibapir.net

لەولاشەوە: بە دڵنیایی تەنیا ئەو حوکم‌و ڕژێمە میراتیی‌و بنەماڵەییانەی، لە جیهانی ئیسلامیی دا هەن، ئەوە ڕەواج پێ دەدەن، کە ئەوە بیدعەتە، ئەوە ناشەرعییە، ئنجا وەك خوای زاناو توانا فەرموویەتی:

﴿ وَٱصْبِرْ نَفْسَكَ مَعَ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُم بِٱلْغَدَوٰةِ وَٱلْعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجْهَهُۥ وَلَا تَعْدُ عَيْنَاكَ عَنْهُمْ ﴾ (الكهف:٢٨) واتە: لەگەڵ ئەوانەدا خۆت بهێڵەوە (مشووریان لێبخۆو پەروەردەیان بکە) کە بەیانیان و ئێواران لە پەروەردگاریان دەپاڕێنەوە، ڕووی (ڕەزامەندیی) وییان مەبەستەو، چاویان لەسەر لامەدە.

ئنجا عەجایب ئەوەیە کە هەندێك لەوانە دێن نیشانەی پرسیار دەخەنە سەر جموجۆڵی ئیسلامیی، کۆمەڵبوونی مسوڵمانان، بەڵام کاریان بەسەر عەلمانیی‌و بەسەر خەڵکی نا ئیسلامیی‌و، نا مسوڵمان‌و بێ دینەوە نیە، کە ئەوە هەر بۆخۆی، جێی گومانێکی خەستەو، وەك پەندە عەرەبییەکە دەڵێ: (يكاد المريب يقول خذوني)، بابای گومانلێکراو خەریکە دەڵێ: بمگرن! باشە ئەگەر گریمان کۆمەڵبوونی مسوڵمانان لەسەر ئیسلام، ناشەرعیی بێ، بێگومان لەسەر غەیری ئیسلام، هەر زۆر زۆر ناشەرعییە! کە ئەوەش درۆیەکی گەورەیە، چونکە ئەسڵ لە مسوڵمانەتیی دا،

www.alibapir.net

کۆمەڵبوونو، پێکەوە بوونە و لێك کۆبوونەوەیە، ئەسڵەن لێك دابڕانو پەرش و بڵاویی و پەرتەوازەیی، بەڵایەکە تووشی مسوڵمانان دەبێ، پێغەمبەر ﷺ لەوبارەوە زۆر فەرمایشتی هەن، بۆ وێنە (یَدُ اللهِ مَع الجماعة)[1] ، (فعليكم بالجماعة فإنما يأكل الذئب من الغنم القاصية)[2] واتە: دەستی خوا لەگەڵ کۆمەڵی مسوڵمانان دایە، هەر لەگەڵ کۆمەڵ دابن، چونکە گورگ تەنیا زەفەر بە مەڕێك دەبات، کە لە مێگەل دابڕاوە.

## بڕگەی سێیەم: سەرگوزشتەی کاری ئیسلامیی:

ئایا ئەم کاری ئیسلامییە، کە ئێمە ئێستا خۆمان لە بەشێکیدا دەبینینەوەو، ئێمە ئەزموونێکین، لەم هەرێمی کوردستانەدا، ئەم کارو جموجۆڵە ئیسلامییە، مێژووەکەی چۆنە؟

بە بۆچوونی من، دەتوانین سێ جۆرە مێژوو دابنێین، بۆ کاری ئیسلامیی:

ameer.maktab@yahoo.com
/AliBapir /AliBapir /MediaAmeerOffice
www.alibapir.net

[1] سنن الترمذي: ٢٠٩٣ والحاكم : ٣٦١ والطبراني في كبير: ٣٤٦١.

[2] مسند أحمد: ١٥٩٠٠، و سنن ابي داود: ٢٧٥٣ بإسناد حسن و سنن النسائي: ٨٤٧ و حَسَّنه الألباني في (صحيح ابي داود).

www.alibapir.net

میـژووی یەكـەم: مێـژووی سـەرهەڵدانی ئیسـلام، ئەگـەر ئێمـە تەماشای پێغەمبەری خاتەم ﷺ بكەین، ئەوەی كە ئێستا ئێمـە دەیكەین لـە قـەدەر خۆمـان: خـەڵك تـێ دەگەیـەنین، هۆشـیاریان دەكەینەوە، قورئانیان پێ دەڵێین، سوننەتیان پێ دەڵێین: پاشان لە ئەخلاقی ئیسلامییان حاڵی دەكـەین و، پێیـان دەڵـێین: بـرا و خوشكینە! خەڵكینـە! بـا ئـاوا خـوا بپەرسـتین و، ئـاوا دینـداریی بكـەین، پێغەمبـەریش ﷺ هەڵبەتـە ئێمـە لەقـەدەر خۆمـان، ئەویش ﷺ لەقەدەر خـۆی هـەر وای كـردوە. ئـەم كۆبوونـەوەو، پێكـەوە دانیشـتن‌و، قورئـان خوێنـدن‌و، یەكـدی هۆنینـەوەو ئامۆژگـاریی یەكـدی كـردن‌و، پـەروەردەكردن‌و ... هتـدە، پێغەمبەریش ﷺ هەر وای كردوە.

بـەڵێ لـە ڕاسـتییدا كـاری ئیسـلامیی، جموجـۆڵی ئیسـلامیی، یەكـەمجار پێغەمبـەری خاتـەم (محمـد) ﷺ دەسـتی پـێ كـرد، ئـەویش بریتـی بـوو لـەوەی: خـەڵك هۆشـیارو بێـدار بكاتـەوە: عەقڵیان هۆشیار بكات‌و، دڵیـان بێـدار بكـات‌و، ڕاسـتیان بكاتـەوە، بەو شێوەیان لێ بكات، كە خوای پەروەردگار لەلای پەسەندن.

میـژووی دووەم: بریتیـە لـە ئـەو هـەموو جموجـۆڵ‌و تێكۆشـانە جۆراو جۆرانەی مسوڵمانان، كـە بەدرێـژایی مێـژووی مسـوڵمانان ویستوویانە ئیسلام بگێڕنەوە بۆ واقیعی ژیانی خۆیان، بۆ وێنـە:

www.alibapir.net

پیـاوێکی وەك (ئـەبو حامیـدی غـەززالیی)، کـە کـاتی خـۆی بەڕێوەبـەری قوتابخانـەی (نظامیـة) بـووە، لـە بەغـدا، لەدواییـدا دەچـێتە حاڵـەتی گۆشەنشـینیی‌و بـیر دەکاتـەوە، حەتمـەن بـیری کردۆتەوە لە دۆخی ئۆممەتو، سەرەنجام کتێبی: (إحیاء علوم الدین) دەنووسێ.

هـەروەها (أبـو حسـن الأشـعري) و (إبـن تیمیـة) و (إبـن الجـوزي)، هـەرکامیان لـە ڕۆژگـار و لـە شـوێنی خـۆی دا، دیسـان شـێخ (عبـدالقادری گـەیلانیی) لـە بەغـدا، هـەروەها (سـەید ئەحمـەدی سەرهەنـدیی) لە هیندو پاکستان، هەموو ئـەو زانـاو پێشـەوایانەو هاووێنـەکانیان، چ لە بەرگی تەسەووفـو تەریقەتدا بـووبن، چ لـە بەرگی زانستی و شەرعییدا بووبن، چ لەبەرگی سیاسییدا بـووبن، چ لە بـەرگی جـەنگـو جیهاددا بـووبن، چ لـەم دوا دواییانـەدا لـە بـەرگـو قـاڵبێکی سیاسـیی‌و چوارچـێوەیەکی حزبییـدا بـووبن، کاری ئیسلامیی بریتیە لە هەموو ئەوانە، هـەموو ئەوانـە هـەوڵ بوون، تێکۆشان بوون لەلایـەن مسوڵمانانەوە، بـۆ ئـەوەی ژینیـان بـەپێی دینیـان بـێ‌و، ئیسـلام بگێڕنـەوە نێـو کایـەکانی ژیـان‌و گوزەرانیان.

میـژووی سـێیەم: دەتـوانین بڵـێین: دوای ڕووخـانی دەوڵـەتی عوسمانیی، چەند هەوڵێك دران:

www.alibapir.net

١)(جمـــال الـــدين الأفغـــاني) و (شـــيخ محمـــد عبـــده) و قوتابييەکانیان.

٢) مامۆستا (سەعیدی نۆرسیی) لە تورکیا، کـە ئـەو لـە هـەموو کـەس چـاکتر زانیویـەتی ئـەو دوا ئاڵقـەی دەوڵـەتی ئیسـلامیی (دەوڵەتی عوسمانیی) چۆن ڕووخا، بە چ پیلانێك؟ لە کتێبەکانی دا باس دەکا، بەتایبەتی لە (السیرة الذاتیة)دا.

٣) (حسن البنا) لە میسر، کە لە ساڵی (١٩٢٨ ز) دەست پێ دەکا، واتە چوار ساڵ دوای ڕووخانی دەوڵەتیی خیلافەت.

٤) (ئەبو لئەعلای مەودوودیی) لە پاکستانو کێشوەری هیندیی.

٥) (شیخ إلیاس کاندهلوي)، کە جەمـەعاتی تەبیلغ پێکدێنێ.

ئەمانـەی دوایـی، زیـاتر ڕووخـانی دەوڵـەتی عوسمـانیی بـوو بـە هانـدەریان، تەماشـایان کـرد: جـاران مسـوڵمانان سـێبەرێکیان هـەبوو، سـێبەرو سـایەیەکیان هـەبوو مسـوڵمانانی کـۆدەکردەوە، کەچـی ئـەو سـایەو سـێبەرە نـەما، مسـوڵمانان لـە هـەر شـوێنێك زوڵمیـان لێ بکـرێ، هـیچ پـەنایان نیـە، بـۆ نموونـە: مسـوڵمانانی (ڕوهینگا) لە بۆرما، هەروەها مسوڵمانان لە خـوارووی ئـەفریقیا، هەروەها مسوڵمانانی (ئیگۆریی) لە چین، قەتڵ عام دەکرێن، کـوا کێ لەسـەریان دێتـە دەنـگ؟! ئایـا ڕژێمێـك کـە بۆخـۆی ڕێشـمەی

www.alibapir.net

بەدەستی ئەمریکاوەیە، خێرو بێرەگەی هەموو ئەمریکا بە تاڵان دەیبات، دەتوانێ بەرگریی لە مسوڵمانان بکات؟! بەڵام ئەوکاتە دەوڵەتی عوسمانیی دەسەڵاتو هێزی هەبوو.

ئەوە مێژووی سێیەمی سەرهەڵدانی جموجوڵی ئیسلامییە، دەتوانین بڵێین: دوای ڕووخانی دەوڵەتی عوسمانیی بوو، کە ئەو جموجوڵانە دەستیان پێکرد، کە یەکەمیان ئەوەی تورکیا بوو، جووڵانەوەکەی (ماموستا مەلا سەعیدی نوڕسیی)، کە پێم وانیە ناوێکی دیاریی کراوی لێنابێ، چونکە نامەکانی ناونان: (رسائل النور)، بەڵام دوای خۆی پێیان گوت: جووڵانەوەی (نوور).

هەروەها جەماعەتی (تەبلیغ)یش، کە پێش (جەماعەتی ئیسلامیی لە پاکستان) کە دامەزرێنەرەکەی (ئەبو لئەعلای مەودوودیی)یە، هەڵبەتە (ئەبو لئەعلای مەودوودیی) پێش ئەوەی جەماعەتی ئیسلامیی پێکبهێنێت، جموجوڵی هەر هەبووە.

دوای ئەویش (حەسەنولبەننا) لە میسر، کە لە ڕاستییدا ئەوەی ئەم لە هەموویان زیاتر چوارچێوەیەکی حزبیی‌و سەروبەرو سیستمی تێدا هەبووە، هەرکامێکیشیان هەل‌و مەرجی کۆمەڵگاکەی خۆی‌و کلتووری کۆمەڵگاکەی و، ئەو بارودۆخە

www.alibapir.net

سیاسییەی کە تێیدا بووە، لەبەر چاوی گرتوە، بۆ وێنە: مامۆستا (سەعیدی نۆرسیی) نەیتوانیوە حیزبێکی سیاسیی دروست بکا، چونکە ئەسڵەن هەر بۆخۆشی هەمیشە هەر گیراو بووەو، دوورخراوە بووەو، لەژێر چاودێرییدا بووە، کە حزبیشی دروست نەکردوە! ئەدی ئەگەر حیزبی دروست کردبایە، دەبێ چۆن بووایە؟!!

کۆتا قسەشم لەم تەوەرەدا ئەوەیە کە بۆ زانیارییتان! وشەی (ئیسلامیی) بۆ یەکەمین جار لە کتێبێکی (أبو حسن الأشعري)، کە لە (٢٦٠)ی کۆچیی دا لەدایك بووە، هەندێك دەڵێن: ساڵی (٢٧٠)و لە ساڵی (٣٢٤)ی کۆچیی دا کۆچی دوایی کردوە، لە کتێبێکیدا بەکاری هێنا بەناوی: (مقالات الإسلاميين واختلاف المصلين)، ئەو کتێبەی ئێستاش هەیە، کە (أبو حسن الأشعري) وشەی (إسلاميين)ی بەکارهێناوە، لەبەرامبەر ئەوانەدا کە نامسوڵمان بوون، هەروەك چۆن ئێمەش ئێستا هەروامانکردوە! زۆرجار گوتوومە: ئەگەر ناچار نەبم، ناو لەخۆم نانێم (ئیسلامیی) لەنێو میللەتێکی مسوڵماندا، بەڵام وەختێك ئەو دەڵێ: عەلمانییم، ئەو دەڵێ: لیبراڵییم، ئەو دەڵێ: سۆسیالیستم، ئەو دەڵێ: کۆمۆنیستم، دەڵێم: باشە خۆ دەبێ کەسانێکیش هەبن، تەعبیربکەن لە ناسنامەی ڕاستەقینەی ئەو خەڵکە

www.alibapir.net

مسـولْمانە، ئێمـەش ئیسـلامیین، واتـە: وەك چـۆن (أبـو الحسـن الأشـعري) ناچـار بـووە بـە ئـەهلی قیبلـە بڵـێ: (إسـلامیین) لەبەرامبەر ئەوانەدا کە ئەهلی قیبلە نـەبوون، ئێمـەش ناچارین لەبەرامبەر ئەوانەدا کە باسی ئیسلام نەبێ، باسی هـەموو شـتێك دەکەن، بەڕێی ئیسلام دا نەبێ، بەهەموو ڕێیەکدا دەڕۆن، بڵـێین: ئێمـە ئیسـلامیین، ئەگـەرنا ئەگـەر ناچـار نـەبین، میللـەتێکی مسـولْمان، هـەمووی هـەر ئیسـلامییەو، هـەمووی هـەر بـەدوای ئیسلام کەوتوە.

بەڵام پێویستە لێرەدا وریا بین!

وەك چۆن هـەلو مـەرجو واقیـع جاری وایـە خوازیـاری ئەوەیـە ناوونیشـانێك بـەکاربێنی، وەك (ئیسـلامیی)، جـاری واشـە هـەلو مەرجەکە: بەجۆرێك دەگۆڕێ کە خوازیـاری ئـەوەبێو، کۆمـەڵ و ڕێکخراوێکـی ئیسـلامیی ناچـار بکـات، پاشـگری (ئیسـلامیی) لـە خۆی بکاتەوە!

ameer.maktab@yahoo.com
/AliBapir /AliBapir /MediaAmeerOffice
www.alibapir.net

بۆ وێنە:

ئەگـەر بـەهۆی ناوونیشـانێك، یـان دروشمێـك، یـان پاشـگرێکەوە، پـەردەو نێوانێـك لـەنێوان ئـەو ڕێکخـراوەو بەشـێك لـە خـەڵكو جەماوەردا دروست بێ، ئایا دەبێ ئامادەییـان نـەبێ ئـەو پـەردەو

www.alibapir.net

نێوان (حـاجز)ە، لـەنێوان: خۆیـانو کـاروپڕۆژە ئیسلامییەکەیان

و، ئامانجە باڵایەکانی دا، کە لـە خزمـەت کۆمـەڵگادان بەگشتیو،

خەڵكو جەماوەردا، لابدەن؟ بێگومان ئێمە هەمیشە دەبێ: جگـە

لــە دەقــەکانی شــەریعەتو، ئامانجــە باڵایــەکانیو، ڕەزامەنــدیی

خوای کاربەجێ، خۆمان بە هیچ شتێکی دیکـەوە نەبەستینەوەو،

نەیکەینە کۆتو زنجیری دەست و پێو گەردنمان!

ameer.maktab@yahoo.com

 /AliBapir  /AliBapir  /MediaAmeerOffice

www.alibapir.net

www.alibapir.net

تەوەری دووەم

# چاوبەخۆداگێڕانەوە لەسەر ئاستی تاكو كۆمەڵو كۆمەڵگا

## دەستپێك:

## چەمك و واتای چاوبەخۆداگێڕانەوە:

چاوبەخۆداگێڕانەوە (مراجعة) بە كورتیی و پوختیی بەو واتایەیە، كە بزانی ئەو ڕێیەی تا ئێستا بڕیوتە، چەندە؟ چۆنت بڕیوە؟ گەیشتوویە كوێ؟ ئەوەندەی كە ماوتە، چۆنی بەرەو ڕوو بچی؟ ئەو ئامانجانەی كە لەسەرەتاوە لەبەر چاوی خۆت ڕەسمت كردوون، چەندیانت هێناونەدی و چەندیانت ماون؟

كە بێگومان ئەوەش شتێكی پێویستە، نەك هەر بۆ كارێكی سیاسییو بۆ جموجۆڵێكی ڕێكخراوەیی، بەڵكو بۆ هەر كەسێك، بۆ نموونە: كەسێك كەسابەت دەكا، بازرگانێكە، یان كەسێك كە كشتوكاڵ دەكا، كەسێك كە پیشەیەكی هەیە، هەردەبێت جار جار چاو بە كارو پیشەكەی خۆیدا بگێڕێتەوە، نەك تاكو دەمرێ لەیەك قاڵب دابێ! ئینسان دەبێ جاروبار هەڵوەستە بكا لەبارەی ئەو كارەوە كە پێیەوە سەرقاڵە.

www.alibapir.net

لێرەدا ئاماژە بە فەرمایشتێکی پێغەمبەر ﷺ دەکەین، کە دەفەرموێ (الكَيّس مَنْ دَانَ نَفْسَهُ، وَعَمِلَ لِمَا بَعْدَ الْموْتِ، وَالْعَاجِزُ مَنْ أَتبَعَ نَفْسَه هَواهَا، وتمَنَى عَلَى اللّهِ الأماني) (رواه الترمذي: ٢٤٥٩، وحسنه وابن ماجه: ٤٢٦٠ ورواه الحاكم: ٧٧٢، وصححه ووافقه الذهبي).

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: عاقڵ کەسێکە لێپرسینەوە لەگەڵ خۆیدا دەکاو، بۆ دوای مردنی کار دەکا، دەستەپاچەش کەسێکە نەفسی دەخاتە شوێن ئارەزووەکانی و، خۆزگان لە خوا دەخوازێ.

شایانی باسە کە گۆڕانکاریی‌و نوێبوونەوە یاسایەکی گشتی خوایە لە گەردوون دا، بۆ نموونە: لە هەر چرکەیەکدا جەستەی مرۆڤ سەدو بیستو پێنج ملیۆن (١٢٥,٠٠٠,٠٠٠) خانەی لێ دەمرن، سەدو بیستو پێنج ملیۆن (١٢٥,٠٠٠,٠٠٠)ی دیکە جێگەیان دەگرنەوە! یانی: بەردەوام ئێمە لە ڕووی جەستەمانەوە لەحاڵەتی ڕووخان و بنیاتناندایین، ئنجا بە دڵنیاییەوە دەبێ لە ڕووی فیکریی‌و سیاسیی‌و کۆمەڵایەتیی‌و ئاکارییشەوە، مرۆڤ بەردەوام لەگەڵ خۆیدا خەریك بێ‌و، ئەو شتانەی کە پێی وایە بەکارنایەن، بە کەڵك نەماون، دەستبەرداریان ببێ، جاری وایە شتێك بۆ کاتێك باشە، بەڵام بۆ دوای ئەو کاتو شوێنە بە کەڵك

www.alibapir.net

نایـەت، دەبـێ وازی لێ بێنـێ، شـتێك كـە بـۆ ئـەوێ پێویسـتە، بیهێنێتە پێش.

ئـەوە هـەم لـەڕووی فیكـرەوە وایـە، هـەم لـە ڕووی بـەكارهێنانی كەل‌و پەلەوەو، لـەڕووی كـاری سیاسییشـەوە هەروایـە، بەتایبـەت لەبواری ئامرازو شێوازەكانی كاردا.

بـەڵێ بـەڕێزان! ئێمـە دەبـێ هەمیشـە ئامانجـەكانمان چەسـپاو و نـەگۆڕاو بـن، بـەڵام ڕێبـازی كـار و چـالاكییەكانمان شـێوازەكان‌و ئامرازەكـان كـە دەیانگرینـە بـەر بـۆ هێنانـەدی ئـەو ئامانجانـە، هەمیشـە دەبـێ خـەریكی چـاوپێداگێڕانەوەو گۆڕانكـاریی تێـدا كردنیان بین، ئەگەر بمانـەوێ كاروچالاكیەكانمان پـڕ بـە پێستی واقیعی خۆمان بن‌و، لە ڕۆژگاری خۆمان بەجێ نەمێنین.

## بڕگەی یەكەم: چاو بەخۆداگێڕانەوە لەسەر ئاستی تاك:

ئایا ئێمە وەك خەڵكی كۆمەڵی ئیسلامیی، دەبێ لـە چی‌و چیدا، چاو بەخۆماندا بگێڕینەوە، بۆ ئەوەی كارێكی ئیسلامیی ڕاسـت‌و دروسـتتر بكـەین، لـەوەی كـە تـاكو ئێسـتا كردوومانـە؟ سـەرەتا پێویستە ئێمە دان بە هەڵـەكانی خۆمانـدا بێـنین، كـە بەتـەئكیـد هەڵەو كەم‌و كوڕییمان هـەن، هـەر كاتێـك خۆمـان پـێ بـێ هەڵـە

www.alibapir.net

بوو، ئنجا خۆ پێ بێ هەڵە بوون، گەورەترین هەڵەیە، خوا دەفەرموێ: ﴿ فَلَا تُزَكُّوٓاْ أَنفُسَكُمۡۖ هُوَ أَعۡلَمُ بِمَنِ ٱتَّقَىٰٓ ﴾ (النجم: ٣٢).

واتە: خۆتان بەپاكو چاك دامەنێن، ئەو (خوا) زاناترە بەوكەسەی پارێزكاریی كردوە.

پێغەمبەری خواش ﷺ فەرموویەتی: (كُلُّ بَنِي آدَمَ خَطَّاءٌ، وخَيْرُ الخَطَّائِينَ التَّوَّابُونَ)[1] واتە: هەموو وەچەی ئادەم هەڵەكارنو، باشترین هەڵەكارانیش زۆر گەڕاوانن (بۆ لای خوا).

ئایا ئێمە دەبێ چاو بەچی خۆماندا بگێڕینەوە، لەسەر ئاستی تاك تاكمان، تاكو كارێكی ئیسلامیی چاكترو ڕاستتر بكەین؟ لە ڕاستیی دا لەسەرمان پێویستە، تاك تاكمان، چاو بە دینداریی و مسوڵمانەتییمان دا بگێڕینەوە.

خوای پەروەردگار ڕوودەكاتە ئەهلی ئیمانو دەفەرموێ: ﴿ وَلۡتَكُن مِّنكُمۡ أُمَّةٞ يَدۡعُونَ إِلَى ٱلۡخَيۡرِ وَيَأۡمُرُونَ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَيَنۡهَوۡنَ عَنِ ٱلۡمُنكَرِۚ ﴾ (آل عمران: ١٠٤)، واتە: با لە ئێوە كۆمەڵێك هەبن، كەسانێك هەبن، كە بانگەواز دەكەن بۆ چاكەو، فەرمان بە

---

[1] سنن الترمذي: ٢٤٩٩. و سنن ابن ماجة: ٤٢٥١. و الحاكم (٢٧٢/٤) و قال: صحيح الاسناد و لم تخرجاه، و سنن الدارمي: ٢٧٦٩.

www.alibapir.net

پەسند دەکەن‌و، ڕێگریی لە ناپەسند دەکەن‌و، هەر ئەوانەش سەرفرازن.

کەواتە: پێشێ دەبێ دینداریی‌و مسوڵمانەتیی هەبێ، ئنجا کاری ئیسلامیی دەبێ، چونکە کاری ئیسلامیی، مسوڵمانان پێی هەڵدەستن‌و، گۆزەش چی تێدابێ هەر ئەوەی لێ دەڕژێ‌و، مسوڵمانان کاروچالاکییەکانیان لە قەدەر دینداریی‌و مسوڵمانەتییەکەیان دەبن.

هەروەها لە سووڕەتی (التوبة)دا، خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ وَٱلْمُؤْمِنَٰتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَآءُ بَعْضٍ ﴾ (التوبة: ٧١)، واتە: ئیماندارانی پیاو و ئافرەت، دۆست‌و پشتیوانی یەکدین، دوایی دەفەرموێ: ﴿يَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَيُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤْتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَيُطِيعُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ سَيَرْحَمُهُمُ ٱللَّهُ ﴾ (التوبة: ٧١)، پێشێ ئەسڵی ئیمان‌و مسوڵمانەتییەکە دەبێ هەبێ، ئنجا ئەو کارو چالاکییانەیان بۆ ئەنجام دەدرێن: فەرمان بە پەسند دەکەن‌و، ڕێگریی لەناپەسند دەکەن‌و، نوێژبەرپا دەکەن‌و، زەکات دەدەن‌و، فەرمانبەریی خواو پێغەمبەرەکەی دەکەن..

ameer.maktab@yahoo.com
/AliBapir /AliBapir /MediaAmeerOffice
www.alibapir.net

www.alibapir.net

مـــن پـــێم وایـــە دەبـــێ لـــە حـــەوت ڕووەوە، چـــاو بەخۆمانـــدا بگێڕینەوەو، هەرچی کە دەیڵێم، پێشـێ مەبەسـتم خۆمـە، ئنجـا ئێوەی خوشكو برایانی بەڕێزم:

### ١) بووناسییەکی تێرو تەواو:

بووناسیی، جارانی دیكەش باسم كردوە: (دنیـا بینیـی)و(جیهـان بینیـی) لەبەرانبـەر (علـم الوجـود، معرفـة الوجـود)دا، غەڵـەتن، چـونكە (جیهـان)یـان (دنیـا) هـەر ئەوەیـە كـە دەبینـدرێ، بـەڵام ئەگەر مەبەستمان هاو واتای: (معرفـة الوجـود)و (علـم الوجـود) بێ، كـە بـە ئینگلیزیـی (Ontology) پـێ دەڵـێن، دەبـێ بڵـێین: بووناسیی، چـونكە (علـم الوجـود) یـان (معرفـة الوجـود) یـانی: ناسینی ئەو بوون (وجود)ە كـە هەیـە، بـە بەدیهێنـەر (خـالق) و بەدیهێنراو (مخلوق)ەوە، بە بینراو و نـەبینراوەوە، بـە دنیـاو بـە دوارۆژەوە.

بۆیـە وشـەی (بووناسـیی) لـە زمـانی كـوردیی دا، تـەعبیر لـەوە دەكات، كە نەمزانیوە پێش بەندە، كەس بەكاری هێنابێ.

www.alibapir.net

زۆر كەس لە بوارى ئیمانو عەقیدەدا، یەكسەر دێنە سەر باسى ئیمان بەخواو، بە فریشتەكانى خواو، بە كتێبەكانى خواو، بەڕۆژى دوایىو، بە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام)!!، من پێم وایە دەبێ قۆناغێك بگەڕێینەوە بۆ دواتر، بۆ (بوونناسیى) چونكە: ئایا ئەو خوایەى تۆ ئیمانى پێ دێنى، چ زاتێكە (سبحانە وتعالى)؟ هەروەها ئەو دنیایەى كە دەڵێى: جێى تاقى كردنەوەیە، چ دنیایەكە؟ ڕۆژى دوایى چۆنە؟ پاشان ئەم بوونە چۆن پەیدا بووە؟ مرۆڤ چییە؟ یانى: پێشێ دەبێ (معرفة)ت هەبێ: خۆت بناسى، دەوروبەرت بناسى، خوا بناسى، گەردوون بناسى، ئنجا ئیمان دروست دەبێ، ئایا بەڵگەمان چییە لەسەر ئەمە؟ تەماشاى قورئان بكەن، قورئانى مەككەیى، كە (٣/٢)ى قورئان پێك دێنێ، تەماشاى بكەن، زۆر باسى خواى پەروەردگار دەكا، خوا چ زاتێكەو گەردوونى بۆچى دروست كردووە؟ مرۆڤى بۆچى دروست كردوە؟ ئێمە حیكمەت لەبوونمان چییەو؟ دنیاو دواڕۆژ چینو چۆنن؟ ... هتد، خواى پەروەردگار زۆرى باسى ئەو بابەتانەى كردووە، لە قورئانى مەككەییدا بەزۆریى باسى ئەو بابەتانە كراوە، بۆیەش كاتێك كە مسوڵمانان قورئانى مەككەییان ئیستیعاب كردبوو، هەزم كردبوو، دوایى زۆر ئاسان بوو، كە دەیانویست ئیمان بەخوا بێنن، دەیانزانى: خوا چ زاتێكە؟! دەیانزانى: فریشتەكان كێن؟ كتێبەكانى خوا چۆنن؟

www.alibapir.net

دەیانزانی: پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام)، کێن‌و چۆنن؟
دەیانزانی کە مانای ژیانی مرۆڤ چییە؟

بە کورتیی و بە کوردیی ئێمە پێویستییمان بە بووناسییەکی تێرو تەواو هەیە، ئەو بووناسییەی کە قورئان‌و سوننەت باسی دەکەن، تاکو هەڵوێستێکی ڕاست‌و دروستمان هەبێ دەربارەی بوون، دەربارەی گەردوون‌و دەوروبەرمان‌و خۆمان، ئنجا لەسەر بناغەی ئەو هەڵوێستە فیکرییە ڕاست‌و دروستە، ئیمان بنیات دەنرێ، ئەگەرنا موشریکەکانی مەککەش خواناس بوون، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَهُمْ لَيَقُولُنَّ اللَّهُ ﴾ (الزخرف: ٨٧) واتە: ئەگەر لێیان پرسی، کێ دروستیکردوون؟ دەڵێن خوا.. ، بەڵام ئایا چۆنیان خوا دەناسی؟ وایان خوا دەناسی، وەك ڕەفیقێکی خۆیان! وایان خوا دەناسی، دەیانهێنایە ئاستی هەندێك لەو شتانەی کە دەیانپەرستن، ئاوایان خوا دەناسی، یانی: مەعریفەتەکەیان تەواو نەبوو، بۆیە ئیمانەکەشیان بەکەڵك نەدەهات.

بەڕێزان! ڕاستییەکەی ئێمە زۆر پێویستییمان بەوە هەیە کە پێش هەموو شتێك، قووڵترو چاکتر خوا (سبحانە وتعالی) بناسین، هەروەها هەموو ئەو شتانەی پەیوەستن بە خوای پەروەردگارەوە: فریشتەکانی خوا، کتێبەکانی خوا، پێغەمبەرانی

www.alibapir.net

خوا (عليهم الصلاة والسلام)، پاشان ڕۆژی دوایی‌و، ئنجا ژیان‌و مرۆڤ، چونکە: ئێستا خەڵکی ڕۆژئاوا، ئەوانیش بەحیساب بڕوایان بەخواو، ڕۆژی دوایی‌و فریشتەکان‌و بە کتێبەکان‌و پێغەمبەران هەیە، بەڵام تەماشای کتێبەکانیان بکەن، چۆنیان بڕوا بەخوا هەیە!بۆ نموونە: لە (سیفری تەکوین)[1]دا دەڵێ: خوا تاکو دوای نیوەڕۆ زۆرانی لەگەڵ یەعقووب دا گرت، هیچیان هیچیانی بۆ نەخرا، دوایی خوا دەستی لە ڕانی یەعقووب گیر کردو، جومگەی ئەژنۆی دەرچوواند، ئنجا خوا فەرمووی: بەرمبدە دەچمەوە ئاسمانێ، یەعقووب گوتی: بەرتنادەم دەبێ وەعدم پێ بدەی، بەرەکەت و پێزم پێبدەی!

ئنجا چۆن باسی پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) دەکرێ؟ بەشێوەیەکی وا کە لە مرۆڤی ئاسایی، ئاسایی تر بووبن! بۆ نموونە: لە باسی داوود[2] دا، ئەو حیکایەت‌و بەسەرهاتە باوە هەیە، کە بەداخەوە هەندێك لە تەفسیرەکانی ئێمەش لە ئیسرائیلیاتەوە وەریانگرتووە، وا دەزانن ئایەتەکانی سوورەتی: (ص: ٢١-٢٦) دەلالەت لەسەر ئەوە دەکەن، کە گوایە داوود نەوەدو

---

[1] بڕوانە: التفسير التطبيقي للكتاب المقدس، العهد القديم، سفر التكوين، الإصحاح:٣٢، ص٦٥٩،٦٦\.

[2] هەمان سەرچاوە: العهد القديم، سفر صموئيل الثاني، الإصحاح: ١١، ص٨٧،٨٨.

www.alibapir.net

نۆ (٩٩) ژنی هەبووەو، تەماعی لە ژنی هاوڕێیەکی خۆی کردوە -کەناوی ئۆریا بووە- پێی جوان بووە، بۆیە ناردوویەتە پێشەوەی شەڕو کوژراوەو، دوایی ژنەکەی مارە کردووەتەوە! ئەوە لە پەیمانی کۆن دایە، بەڵام لە ئایەتەکان دا باسی ژنان نیەو، باسی مەڕان دەکەن‌و، من لە شوێنی دیکەدا بە تێروتەسەلی ئەوەم باس کردوە.[1]

هەروەها پەیمانی کۆن، باسی سولەیمان[2] دەکا، دەڵێ: سولەیمان بتپەرست بووە!

هەروەها باسی لووط دەکات[3]: زۆر بەشێوەیەکی ناڕێك.

هەروەها باسی ئیبراهیم دەکات، (خليل الله)[4] بەشێوەیەکی وا گوایە: پیاوێکی بە غیرەت نەبووە لەڕووی نامووسەوە!

هەورەها، کتێبەکانی خوا، ئایا کتێبەکانی خوا، ئاوان وەك ئەوەی لەبەر دەستی (ئەهلی کیتاب)دان؟ تەماشایان بکەن: دەڵێی حیکایەتی بەرئاگردانن، سەد حیکایەتی پڕ درۆو

---

[1] موسوعة: الإسلام كما يتجلي في كتاب الله، الكتاب الخامس: الإيمان برسل الله و أنبيائه، ص ٩٠-٩٣، ط ٢٠١٧/٣م.

[2] هەمان سەرچاوە: العهد القديم، سفر الملوك، الإصحاح:١١، ص ٧٣٠- ٧٣٢.

[3] هەمان سەرچاوە: العهد القديم، سفر التكوين، الإصحاح: ١٩، ص٥٢.

[4] هەمان سەرچاوە: العهد القديم، سفر التكوين، الإصحاح: ٢٠ ص٥٣-٥٤.

www.alibapir.net

دەلەسەیان تێدایە! خەڵکی ڕۆژئاوا ناحەقی نەبووە لەو دینە ڕابکا، کە پڕە لە شتی پڕوپووچو ئەفسانە، کە هەمووی پێچەوانەی واقیعو، پێچەوانەی عەقڵیشە.

کەواتە: دەستەبەرکردن و لە عەقڵو دڵی خۆدا چەسپاندنی بووناسییەکی ڕاستو دروست، پێم وایە ئەوە هەنگاوی یەکەمی چاوبەخۆدا گێڕانەوەمانە، ئەویش بەوە دەبێ کە زۆر لە قورئانو سوننەت ورد بینەوە، نەك تەنیا لە حوکمە شەرعییەکان، کە زانایان دەڵێن: هەموو ئایەتەکانی ئەحکام پێنج سەد (٥٠٠) ئایەتن، کە من ئەوەم پێ ڕاست نیە، چونکە ئەحکام لە هەموو قورئان وەردەگیرێن، بەڵام گرنگ ئەوەیە: ئایا ئەو قورئانە، کە شەش هەزارو دووسەدو سیو شەش (٦٢٣٦) ئایەتە، ئێمە خولاسەی بکەینەوە لەو حوکمانەدا کە پێیان دەگوترێ: حوکمە کردەییەکان (الأحكام العملية) دەگونجێ، ئەدی ئەو هەموو قورئانە گەورەیە چی لێ بکەین! ئایا نابێ بێین دیراسەی بکەین، لێی بکۆڵینەوە؟ بۆ ئەوەی مەعریفەتو زانینێکی قووڵترمان هەبێ بەرامبەر بەخوا، سیفەتەکانی خوا، پاشان بەرامبەر بە پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام)و مەقامی بەرزو بێ وێنەیان؟! هەروەها بەرامبەر بە ڕۆژی دوایی، ئنجا بەرامبەر بە فریشتەکانی خواو، کتێبەکانی خوا! ئنجا کە

www.alibapir.net

ئیمانمان بەوانە هێنا، بەو شێوەیەی کە بووناسیی ڕاستو دروستی ئیسلامیی دەڵێ، ئنجا ئیمانو عەقیدەکەمان جێی خۆی دەگرێ.

ameer.maktab@yahoo.com
/AliBapir /AliBapir /MediaAmeerOffice
www.alibapir.net

**٢) لە وەحیی تێگەیشتنێکی قووڵو بەربلاو:**

ئەگەر بمانەوێ لە چاوبەخۆدا گێڕانەوەمان دا، سەرکەوتوو بین، هەنگاوی دووەم بریتییە لە تێگەیشتنێکی قووڵو فراوان لە وەحیی خوا (عزوجل)، کە لە قورئانو سوننەت دا بەرجەستەیە، چونکە تەنیا وەحیی خوا بەکەڵکی هەموو کاتو شوێنێك دێ، گرفتی گەورەی مسوڵمانانیش دوورکەوتنەوەیانە لە نووری وەحییو، دەرگای عەقڵی خۆداخستنو دەستو پێی خۆبەستنیانە، بە ئیجتیهادو بیروبۆچوونی پێشینانیان، ئەو دەردو نەخۆشییە کوشندەیەی کە خوای کارزان لە چەندان ئایەت دا، سەرزەنشتی کافرو موشریکەکانی لەسەر کردوە، بۆ وێنە:

﴿ وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ ٱتَّبِعُواْ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ قَالُواْ بَلۡ نَتَّبِعُ مَآ أَلۡفَيۡنَا عَلَيۡهِ ءَابَآءَنَآۚ أَوَلَوۡ كَانَ ءَابَآؤُهُمۡ لَا يَعۡقِلُونَ شَيۡـٔٗا وَلَا يَهۡتَدُونَ ١٧٠ ﴾

(البقرە) واتە: ئەگەر پێیان بگوترێ: شوێن ئەوە بکەون کە خوا

www.alibapir.net

دایبەزاندووە، دەڵێن بەڵکو شوێن ئەوە دەکەوین کە باب و باپیرانی خۆمان لەسەری دیوە، ئەدی ئەگەر باب و باپیرانیان هیچیان نەفامیبێ و بە ڕێی ڕاستیان نەزانیبێ!!

**٣) ئیمانێکی مەحکەمو نەلەخشاو:**

هەرچی کەمو کوڕییمان هەیە، دەبێ دانی پێدا بێنین، کە بەهۆی ناتەواویی ئیمانەکەمانەوەیەو، لەو سۆنگەیەوە، هەڵە و پەڵەو چۆرتممان بەسەر دێن، هاوەڵان (خوا لێیان ڕازی بێ) کە باشترین نەوەنو، سەرمەشقی ئێمەنو خوا لە قورئاندا بە کەسی نەفەرمووە: لێیان ڕازیمو لەخۆشمیان ڕازیی دەکەم: ﴿رَّضِيَ ٱللَّهُ عَنۡهُمۡ وَرَضُواْ عَنۡهُ﴾(التوبة: ١٠٠)، مەگەر ئەوانو شوێنکەوتووانی ڕاستەقینەی ئەوان، ئنجا ئەوان بەڕاستیی جیاوازییان لەگەڵ نەوەکانی دیکەی ئوممەت دا، ئەوە بوو، کە ئیمانەکەیان زۆر مەحکەمو نەلەخشاو بووە.

فەرموودەیەك لەو بارەوە:

(ڕۆژێك (حنظلة) دەچێ بۆ لای ئەبووبەکر (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: تووشی نیفاق بووم، ئەبووبەکردەڵێ: بۆچی؟ دەڵێ: کاتێ

www.alibapir.net

کە لە خزمەت پێغەمبەرین ﷺ وەك بەهەشت و جەهەننەم ببینین وایە، (سەیر نیە بینیبیشیانن، خوای پەروەردگار بە جۆرێك نیشانی دابن) بەڵام کە دەچینەوە بۆ لای ماڵ و منداڵ، زۆر شتمان لەبیر دەچێ و وا نابین. ئەبووبەکر (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: ئنجا بەخوا منیش هەروام، هەموومان هەروایین، وەرە بابچین بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ، دەچن بۆ لای پێغەمبەر ﷺ، پێغەمبەری خواش ﷺ دەفەرموێ: ئەگەر لەسەر ئەو حاڵەتەی کە لەلای منن، بەردەوام بن، (لصافحتکم الملائکة علی فرشکم وفي طرقکم)، لەسەر جێگەکانتان، لەسەر ڕێگاکانتان، مەلائیکەت تۆقەتان لەگەڵدا دەکەن).[1]

من زۆرجار بیرم لە وەزعی خۆمان کردۆتەوە: گرفتێکی گەورە یان بچووکمان بۆ دێتە پێشێ، کە لێی دەکۆڵیەوە، هۆکارەکەی فیکریی نیە، زیاتر شتی نەفسییە، یانی: بۆیە لەبواری ڕەوشت و ڕەفتاردا، مامەڵەمان لەگەڵ یەك دا دروست نیە، چونکە سەرو سینەمان پێکەوە تەواو نیە، پێم وایە ئەوەش هەمووی دەگەڕێتەوە بۆ هەبوونی کەموکوڕیی لە ئیمانەکەمانداو، لە پەیوەندییمان لەگەڵ خوادا.

---

[1] صحیح مسلم: ٢١٠٦.

www.alibapir.net

### ٤) عیبادەتێكی ساغو بێ خلت:

پێم وایە لەبواری خواپەرستییە تایبەتییەكان (العبادات الخاصة، العبادات المحضة)،دا زۆر پێویستییمان بەوە هەیە، موراجەعەی خۆمان بكەینەوە، ئێستا ئێمە ئەوانەی كە دانیشتووین، چەند كەسمان ڕۆژووی سوننەتی هەیە، شەونوێژی هەیە، نوێژە سوننەتەكانی دیكەی هەن، قورئان خوێندنی زیادەمان هەیە؟ دەبێ ئینسان بیر لەخۆی بكاتەوە، با وەك ئەوەمان لێ نەیەت، كە لە یاداشتەكانی خۆمدا نووسیومە: كاتی خۆی لەساڵی (١٩٨١-١٩٨٢) لە گوندی (بەردەڕەش)[١] بووم، لەوێ ڕۆژانی دووشەممەو پێنجشەممان بەڕۆژوو دەبووم، شەونوێژێكم دەكردو، هەندێ عیبادەتی زیاد، بەڵام فەقێیەكان هەڵنەدەستان بۆ نوێژی بە كۆمەڵی بەیانی، منیش گوتم: برایان! بۆچی نوێژی بەكۆمەڵی بەیانییان ناكەن؟ ئەوانیش پێیان سەیر بوو، دەیانگوت: فەقێو نوێژی بە كۆمەڵی بەیانیان نەگوتوە! زۆریان پێ سەیر بوو كە پێنجشەممەو دووشەممان بەڕۆژوو دەبووم، دەیانگوت: ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان قەیناكات، بەڵام دووشەمەو پێنجشەمە بۆچی! منیش دەمگوت: ئەدی لە (فقە)دا ئەو مەسەلانە ناخوێنن لە نامیلكەی (فتح القریب)دا، لە كتێبی (المغني)دا، لە كتێبی

---

[١] لە نیزیك شارۆچكەی (بانە) لە كوردستانی ئێران.

www.alibapir.net

(إعانة)دا؟ دەیانگوت: با، بەڵام ئەوە بۆ کاتی مەلایەتییە! منیش دەمگوت: ئەدی نابێ لە ئێستاوە ئیشی پێ بکەن، تاکو دوایی کە بوونە مەلا، ببن بە سەرمەشقێکی باش بۆ خەڵك؟

زۆر جار بیردەکەمەوە لە حاڵو بارودۆخی خۆمان: هەندێکمان پێمان وایە: هەر لەبەر ئەوەی کە پێمان دەڵێن: ئیسلامیی، هەموو شتێکمان تەواوە! وانیە، نە لەبەر ئەوەی کە پێمان دەڵێن: مسوڵمان هەموو شتێکمان تەواوەو، نە لەبەر ئەوەی پێمان دەڵێن: ئیسلامیی، لە هەموو ئاوان پەڕیوینەوە! بۆیە دەبێ چاو بە عیبادەتی خۆماندا بگێڕینەوە، عیبادەتی شەخسیی، بەڵێ من باسی کاری ئیسلامییتان بۆ دەکەم، بەڵام وەڵڵاهی کەسێك بەڕاستیی عابید نەبێ بۆ خوا، بەدڵنیایی عامیلیش نابێ بۆ ئیسلامو، ئەگەر کردەوەو چالاکییشی هەبێ، کەڵکێ ناگرێ!

بێگومان ناشڵێم: بۆخۆم لە هەموو ئاوان پەڕیومەتەوە، بەڵکو هەمووومان پێویستییمان بەوە هەیە، چاو بەخۆماندا بگێڕینەوە، بۆ نموونە: ئایا نوێژەکانمان بە جەماعەت دەکەین لە مزگەوت؟ خوا پشتیوان بێ هەمووومان هەر واین، چ وەك سەرکردایەتیی و، چ لە ئاستی کادیر و ئەندامان، دەبێ هەروابین، ئنجا نوێژە سوننەتەکان بەگشتیو بەتایبەت شەونوێژ، پاشان وێڕای ڕۆژووی

www.alibapir.net

مـانگی ڕەمـەزان، ڕۆژووی سـوننەت، ئنجـا قورئـان خوێنـدن‌و، زیکرەکـانی بـەیانیان‌و ئێـواران‌و، زیکرەکـانی دوای نوێـژەکان، پاشـان جـار جـار چـوونە ئیعتیکـاف، ئایـا چـوونە ئیعتیکافمـان هەیە؟ با جار جار بچینە ئیعتیکافەوە، ئەگەر چەند ڕۆژێکیش بێ، پێغەمبەر (محمد) ﷺ پێغەمبەری خوا بوو، لەسەر ئاستی هەموو بەشەرییەت پێغەمبەر بوو، کەچی هەموو ڕەمەزانێك دە (١٠) ڕۆژەکـەی کۆتـایی دەچـووە ئیعتیکافـەوە، نەیدەفـەرموو: دەرفەت نیەو، پێم ناکرێ‌و سەرقاڵم! سەرقاڵی چیی! هیچ شتێك نـابێ تـۆ سـەرقاڵ بکات لـەوەی کـە پەیوەنـدییت لەگـەڵ خـوادا، گەرم‌و گوڕو قایم‌و مەحکەم بێ، چونکە ئەگەر لـەوێوە بەکـەڵك نـەهاتین، لـە هـیچ کـام لـە شـوێنەکانی دیکـەدا بەکـەڵك نایـەین، بەتایبەت نوێژ، وەك برایەکی دڵسۆزی خۆتـان پێتـان دەڵـێم: بـە بەلاش نیە کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ:

(أوّلُ مَـا يُحَاسَـبُ بِـهِ الْعَبْـدُ يـوم القيامـة مـن عملـه: صلاته، فإن صلحت فقد أفلح وأنجح...)[١]، واتە: یەکەمین شـت لـە کردەوەکـەی کـە بەنـدە لـە ڕۆژی قیامەتـدا، لەسـەری لێپرسـینەوەی لەگەڵـدا دەکرێ، نوێژە.

[١] جامع الترمذي: ٣٧٨، و سنن النسائي: ٤٦٢، و مسند أحمد: ٩٢٩١، و الطبراني في الأوسط: ٧٨١٤ .

www.alibapir.net

**٥) نەفسێکی تەزکیە کراو و پاکو پوخت:**

بەڕێزان! ئەوانە هەموویان پێکەوە، وەك ئاڵقەکانی زنجیرێك، یەکدی دەبەستنەوە: کاتێك ئینسان نەفسێکی تەزکیەکراوی دەبێ، عیبادەتێکی باشی هەبێو، کاتێ عیبادەتێکی باشی دەبێ، ئیمانێکی مەحکەمی هەبێو، کاتێك ئیمانێکی مەحکەمو دامەزراوی دەبێ، کە لە ئیسلام دا تێگەیشتنێکی قووڵو فراوانی هەبێو، کاتێك ئەوەشی دەبێ، بووناسییەکی ڕاستی هەبێ، ئەوانە هەموویان پێکەوە بەستراون.

وەك زۆرجاران باسم کردوە: زۆربەی گرفتو کێشەکانمان – بە بڕوای من – دەگەڕێنەوە بۆ ئەوە کە نەفسی خۆمان چاك تەزکیە نەکردوە، نەفسی تەزکیە کراویش ئەوەیە کە لە دەروونەوە خۆت پاکو چاك بکەی، چونکە: بۆ ئەوەی زمانت تەعبیری بە هەڵە بەکارنەهێنێتو، چاوت نەزەر نەکاو، گوێت خراپە نەبیستێو...هتد. پێویستە پێش ئەوە دەروونت پاکو پوختو ڕێك بێ، ئەگەر لە دەروونەوە صاف بووی: ڕوانینی چاوو، تەعبیری زمانو، بیستنی گوێو، جووڵەی دەستو لاقو...هتد، هەمووی زەبت دەبی، ئاو دەبێ لە سەرچاوەوە ڕوون بێ، چونکە ئەگەر ئاو سەرچاوەی لێڵ بێ، لە جۆگەلە ڕوون نابێتەوە، ئەوەش کار لەسەرخۆ کردنی دەوێو، کەس لە پڕ

www.alibapir.net

نـەبووە بـە كـوڕو، كـەس لـە زگـی دایكـی خۆیـدا چـاك نـەبووە، ئینسان دەبێ خۆی چاك بكا: ﴿قَدْ أَفْلَحَ مَن تَزَكَّىٰ ﴿١٤﴾﴾(الأعلـى: ١٤)، (تزكّى) لەسەر كێشی (تفعّلْ)ە، دەبێ كـار لەسـەر خـۆت بكـەی و، خۆت ماندوو بكەی و كۆشش بكەی.

با وەك ئەزموونی شەخسیی خۆم شتێكتان بـۆ بـاس بكـەم: كـاتی خـۆی – ئێسـتاش كـەم و زۆر هـەر بـەردەوامم- شـەوانە كـە دەچـوومە سـەر جێگـای خـەوتن، هەرچـی لـەماوەی ئـەو ڕۆژەدا بووە، وەك فیلمێك دەمهێنایەوە بەرچاوی خـۆمو، خـۆمم لەسـەر موحاسەبە دەكرد: چیم چاك بووە، چیم خراپ بووە، لـە قسـەی زمـانو كـردەوەی ئەنـدامـەكانو، خولیـاو مەبەسـتەكان؟! مـرۆڤ ڕۆژانـە چـالاكییو جموجـۆڵی هەیـە، بۆیـە ئێـوارە كـە دەچـیەوە سـەر جێگایەكـەت، بـا كاتێكـت هـەبێ شـەوانە، دابنیشـیو، بـیر بكەیـەوە كـە: ئـەمڕۆ چیم كـردوە! چـیم گوتـوە! چـۆنم كـردوە! دەبـێ مـرۆڤ چاودێری خـۆی بـێ و، لێپرسـینەوە لەگـەڵ خۆیـدا بكـات، چـەند لـە شـتەكانم بەكـەڵك هـاتن، چـەندیان بـە كـەڵك نەهاتن؟!

ameer.maktab@yahoo.com

 /AliBapir  /AliBapir  /MediaAmeerOffice

www.alibapir.net

www.alibapir.net

**٦) تەقوایەکی کاڵدار:**

مەبەستم لە تەقوای کاڵدار، ئەوەیە کە: جاری وا هەیە، کەسێك بەحیساب عیبادەتێکی زیادە دەکات، بەڵام لەسەر حیسابی کارێکی لەخۆی چاکترەو قازانجی سەری مایە دەخوات! ڕەنگە جاری دیکەش لە شوێنی دیکە باسم کردبێ، بەڵام وەك عیبرەت بیگێڕمەوە باشە: جارێك برایەکی خۆمان، ڕۆژی پێنج شەممە یان دوو شەممە بوو، بەڕۆژوو بوو، برایانی مەکتەبی سیاسی لەسەر شتێ موحاسەبەیان دەکرد، دیار بوو بەناهەق، قسەو شێوازی زبر، دڵی برایانی مەکتەبی سیاسیی ڕەنجاندبوو، منیش تەماشایەکم کردو گوتم: فلانکەس گیان!

گوتی: بەڵێ.

گوتم: ئەگەر ڕۆژووەکەت نەگرتبایەو، دڵی ئەو برایانەت نە ڕەنجاندبایە بە ناحەق، خێرت زۆر زۆر زیاتر بووا تۆ بە حیساب بۆیە بەڕۆژووی، ڕۆژووی سووننەت، بۆ ئەوەی لەخوا نزیك بیەوە! شتێکی نا حەقی کردبوو و دڵی برایانیشی بە ناحەق ڕەنجاندبوو، نەشی دەسەلماند، گوتم: کاکە ڕۆژووە سوننەتەکەت مەگرەو، تۆزێك شێوازت جوان بێ، چاکترە!

www.alibapir.net

بۆیە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: (إن المؤمن ليدرك بحسن خلقه درجة الصائم القائم) رواه أبو داود: ٤٧٩٨. ئەمە زۆر جێی سەرنجە! مرۆڤی ڕەوشت جوان، کەسێ کە هەمیشە بەڕۆژوو بێو، هەمیشە شەونوێژ بکا، بە ڕەوشتی جوان، دەگاتەوە پلەی ئەو! چونکە ئەسڵەن ئەو ڕۆژوو و نوێژە، بەڵێ عیبادەتەو تاعەتەو بۆ خوایەو، پاداشتەکەی لە قیامەتێ یە، بەڵام دەبێ شوێنەوارەکەشی لەدنیادا دەربکەوێ، ئەگەر ڕۆژوو ڕۆژوو بێو، نوێژ نوێژ بێ، دەبێ شوێنەوارەکەشی لەسەر ڕەوشتو هەڵسو کەوتی مرۆڤ دەربکەوێ.

ameer.maktab@yahoo.com
 /AliBapir  /AliBapir  /MediaAmeerOffice
www.alibapir.net

**٧) ڕەوشتو ئاکاری بەرزو پەسند:**

کۆتا بوار کە پێم وایە دەبێ چاك چاوپێداگێڕانەوەی خۆمانی تێدا بکەین: ڕەوشتو ئاکاری بەرزو پەسندە، کە ئەویش هەر بەرهەمی ئەوانەی پێشووە، چونکە ئەگەر مرۆڤ ئەهلی تەقوا بوو، نەفسی تەزکیە کراو بوو، بە تەئکید ڕەوشتو ئاکاریشی بەرزو پەسەند دەبێ، ئەمیش لە چەند شتێك دا نمایان دەبێ، کە ئەم سێیانەیان زۆر گرنگن:

www.alibapir.net

**١- قسەو تەعبیری جوانو شیرین:**

یەكێك لەو شتانەی كە دەبێ لێی وریـا بـینو، بەكـەمی نـەزانین: (قسەو تەعبیری جوان)ە، دەبێ مرۆڤ هەوڵبـدات تـەعبیری جـوان بـەكاربێنێ، لەسـەرەتاوە ئامـاژەم بـەوەدا، كـە: هەرچـی دەیڵـێم، پێشتر ڕووم لەخۆمەو بۆخۆمە، ئنجا بۆ ئێوە، بەڕێزان! تەعبیری جوان زۆر گرنگە، خوای پـەروەردگار دەفـەرموێ: ﴿ وَقُل لِّعِبَادِى يَقُولُواْ ٱلَّتِى هِىَ أَحْسَنُ ۚ إِنَّ ٱلشَّيْطَٰنَ يَنزَغُ بَيْنَهُمْ ۚ ﴾( الإسراء: ٥٣) ، واتـە: بە عەبدەكانم بڵێ: كام قسە باشترە، ئەوە بكەن، چونكە شـەیتـان نێوانیـان تێـك دەدا، واتــە: لـەمیانی تـەعبیری ناڕێـكو وشـەی ناڕێكو زبـردا، بـەینیان تێك دەدا، گومـانی تێدا نیـە تـەعبیری ڕێكو وشەی جوانو بەنەزاكەت، چاكتر دەچێتە دڵی مرۆڤەوە.

**٢- دڵو دەروونی ساغو پاكو دڵسۆز:**

هەڵبەتە تەعبیری بە نەزاكـەتو، وشـەی جـوانیش، بـەزۆریی لـە دڵێكی پڕ لە خۆشەویستیی و دڵسۆزو پـاكو چـاكو بـێ خڵتـەوە پەیـدا دەبـێ، خوشـكو بـرا بـەڕێزو خۆشەویسـتەكانم! دڵسۆزانە دەڵێم: حەیفە ئەو دڵو دەروونە كە خوا بەپاكو چاكیی‌و سـاغو

www.alibapir.net

سەلامەتیی پێی داوین، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ يَوْمَ لَا يَنفَعُ مَالٌ وَلَا بَنُونَ ﴿٨٨﴾ إِلَّا مَنْ أَتَى ٱللَّهَ بِقَلْبٍ سَلِيمٍ ﴿٨٩﴾ ﴾ (الشعراء: ٨٨ – ٨٩)، واتە: ئەو ڕۆژە نە سامانو نە کوڕان دادی کەس نادەن، مەگەر کەسێ بە دڵێکی ساغو سەلیمەوە بێتەوە لای خوا.

ئایا حەیف نیە ئەو دڵە کە دەتوانین پڕی بکەین لە خۆشەویستیی خوا، خۆشەویستیی پێغەمبەر ﷺ، عەزەمەتو گەورەیی خوا، دڵسۆزیی بۆ ئیسلامو مسوڵمانان، حەیف نیە پڕی بکەین لە بوغزو غەرەزو کینەو حەسەدو کیبرو، ئەو سیفەتە پیسانە، ئەوانە هەموویان زبڵو زاڵن! ئنجا تۆ تەنەکەی زبڵ، شتی جوانی تێ ناکەی، بەڵکو شتێکت پێویست نەبێ، بۆ نموونە کلینیکس، دەیخەیە تەنەکەی زبڵەوە، ئنجا ئەو دڵەمان حەیفە بیکەین بە تەنەکەی زبڵو، پڕی بکەین لە بوغزو کینو غەرەزو حەسەد و کیبرو... هتد، بەڕاستیی ستەمو حەیفە!

دەبێ لەخۆشمان وریابینو، پێمان وانەبێ: کە ئەو شتانە ئێمە ناگرنەوە، چونکە جاری وا هەیە، شەیطان بەوەش فێڵمان لێ دەکا!

ئایا پێغەمبەر ﷺ بەکێی فەرمووە: خۆتان لە حەسوودیی بپارێزن، چونکە حەسەد چاکەکان دەخوات، وەك چۆن ئاگر دارو

www.alibapir.net

تەختە دەسووتێنێ: (إياكم والحسد، فإن الحسد يأكل الحسنات، كما تأكل النار الحطب) رواه أبوداود: ٤٩٠٣، بێگومان بە هاوەڵان (صحابة) کەواتە: هاوەڵان ئەگەری هەبووە تووشی حەسەد ببن.

هەروەها ئایا بەکێی فەرمووە: خۆتان لە خۆبەزلگریی (کبر) بپارێزن و، هەر کەس تۆزقاڵێك کیبری لە دڵ دا بێ ناچێتە بەهەشت: (لا يدخل الجنة من كان في قلبه مثقال ذرة من كبر) رواه مسلم: ٩١. بێگومان بە هاوەڵانی فەرمووە.

هەروەها ئایا خوا بەکێی فەرمووە: خۆتان لە بەدگومانیی (سوء الظن) بپارێزن؟ کە خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱجۡتَنِبُواْ كَثِيرٗا مِّنَ ٱلظَّنِّ إِنَّ بَعۡضَ ٱلظَّنِّ إِثۡمٞۖ وَلَا تَجَسَّسُواْ وَلَا يَغۡتَب بَّعۡضُكُم بَعۡضًاۚ ﴾ (الحجرات: ١٢)، بێگومان بە ئیمانداران دەفەرموێ، پێش هەموو کەس بە هاوەڵانی فەرمووە، کەواتە: با ئێمە پێمان وانەبێ کە عەفوو کراوین لەو گوناهە گەورانە، لەو سیفەتە نزم (رذائل)ە دەروونییانە، بەڵکو بە پێچەوانەوە: من بۆم دەرکەوتوە: مرۆڤ تاکو پێگە و پایەی بەرزتر بێ، زیاتر ئەگەری ئەوەی هەیە تووشی ئەو عەیبە دەروونییانە ببێ.

کێ تووشی حەسادەت و، خۆکوتان بۆ زەعامەت و، خۆبەزلگریی و ...هتد دەبێ؟ بێگومان ئەوەی کە بەرپرس و کاربەدەستە و

www.alibapir.net

خـــەڵکی بەدەورەوەمیــە ، چــونکە خــەڵکی ســادە، کــەمتر ئــەو نەخۆشییانەیان تووش دەبن.

لە ژیاننامەی (عبدالله بن مسعود) دا هاتووە  خوا لێی ڕازی بێ کە ڕۆژێك ئاوڕی دایەوە بینی کۆمەڵە کەسێك وەك ڕێزلێگرتن لە پشتی دەڕۆیشتن، گوتی: ئیشێکتان بەمنە؟

گوتیان: نەخێر.

گـوتی: ئـەوە بـۆ کـابرای شـوێنکەوتوو زەبوونییـەو، بـۆ بابـای شوێنخراو (متبوع)یش لە خۆبایی بوونە!

واتە: وەرن لە تەنیشتم بڕۆن، بۆچی بەدوام کەتوون؟!

هەروەها ڕۆژێك (عمر بن الخطاب) خوا لێی ڕازی بێ (أبي بن کعب) دەبینێ کۆمەڵە خەڵکێك لە پشتی دەڕۆن، لێی تووڕە دەبێ و هـەمان قسـەی (إبـن مسـعود) دووبـارە دەکاتـەوە: (فإنها ذلـة للتابع، فتنة للمتبوع)[1] ئنجا وا پێدەچێ ئەو تـەعبیرە قسـەیەکی باو بووبێ لە نێو هاوەڵان دا.

مەبەسـتم ئەوەیـە: بـا خۆمـان بپارێزین لـەو ڕەوشـتو ڕەفتـارو ئاکارانەی کە دزێون و نـاڕێکن، بـا هەمیشـە خۆمـان بپشـکنین و،

---

[1] سنن الدارمي: ٥٣٢، و (الكتاب المصنف) لابن أبي شيبة: ٢٦٥٣١.

www.alibapir.net

هەرگیز خاتری خۆمان نەگرین و، پێمان وابێ ئێمە لە هەموو (ئاو)ان پەڕیوینەوە، پێویستمان بەو وردە شتانە نابێت! نەخێر ئەوانە وردە شت نین، گوناهی گەورەن و، خوای پەروەردگار زۆر بە گەورەیی باسی کردوون.

**٣- با تەرازوومان شەریعەتی خوا بێ نەك میزاج و طەبیعەتی خۆمان:**

بەڕێزان! با ئێمە تەرازوو و پێوەرمان بۆ هەڵسەنگاندنی: گوناهو چاکەو، خێرو شەڕ، قورئان و سوننەت بێ، میزاج و تەبعی خۆمان نەبێ، جارێك باسی ئەوە كرا برایەكی ئێمە، بەرپرسێكمان تۆقەی كردبوو لەگەڵ ئافرەت، منیش گوتم: بەهەرحاڵ ئەگەر ئەو ئەوكارەی كردبێ، گوناهێكی گچكەی كردوە، فەرموون: ئەوە قورئان و سوننەت و شەریعەت، تۆقە كردن لەگەڵ ئافرەت دا، هەروەك نەزمرە، گوناهێكی گچكەیە، چونكە گوناهی گچكە ئەوەیە سزای دنیایی، یان هەڕەشەی قیامەتیی لەسەر نەبێ، هەڵبەتە نەزمرو هاووێنەكانی هەر حەڕامن، بەڵام نە سزای دنیاییان لەسەرە، نە هەڕەشەی قیامەتیی، گوناهی گەورە (كبیرة)ش پێناسەكەی لەلای زۆربەی

www.alibapir.net

زانایـان ئەومیـە، کـە: سـزای دنیـایی یـان هەڕەشـەی قیامـەتیی (عقوبة دنيوية، أو وعيد أخروي) لەسەر بێ.

ئنجا گوتم: بـەڵام پاشملـە زەمکردنەکـەی ئێـوە بـۆی، غەیبەتـەو غەیبەتیش گوناهی گەورەیە! ئێوە بـە حساب لۆمـەی برایـەکتان دەکەن کـە گونـاهێکی گچـکەی کـردوە، کەچـی بۆخـۆتـان گونـاهی گەورە ئەنجام دەدەن‌و، ڕەنگە هـەر فیکریشـی پـێ نەکـەن!! بـەڵێ دەبێ پێوەرو تەرازووەمان قورئان‌و سوننەت‌و شـەریعەت بـێ، بـۆ هەڵسەنگاندنی چاکەو خراپە، نەك عورف‌و عادەتی کۆمەڵگا.

## بڕگەی دووەم: چاوبەخۆدا گێڕانەوە لەسەر ئاستی کۆمەڵی مسوڵمانان:

بـا سـەرنج بـدەین خـوای پـەروەردگار چـۆن باسـی کۆمـەڵی مسوڵمانانی کردوە:

١) ﴿ إِنَّمَا ٱلۡمُؤۡمِنُونَ إِخۡوَةٞ ﴾ الحجـرات: ١٠، واتـە: بـڕواداران تـەنیا بران، واتە ناگونجێ بڕواداربن‌و برا نەبن، ئەوە وەك پیاوانیان‌و، وەك ئافرەتانیشیان خوشکن‌و پێکەوەش خوشك‌و بران.

www.alibapir.net

٢) ﴿ وَٱلۡمُؤۡمِنُونَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتُ بَعۡضُهُمۡ أَوۡلِيَآءُ بَعۡضٖ ﴾ (التوبـــــــة: ٧١)، تەماشـای فەرهەنگـەكانی زمـان بكـەن: (أولیـاء) كـۆی (ولـي)یـە، (ولي)یش ئەسڵی خۆی لە (وَلْي)ەوە هاتوە، ﴿لیلیني مـنكم أولـوا الأحـلام والنهـى﴾[1] (لیلـیني: لیقـربني) یـانی: بـا خـاوەن عـەقڵو تێگەیشـتووەكانتان لـێم نزیـك بـن – لـەكاتی نوێـژكردن دا – ، كەواتە (وَلْي) یانی: (قُرْب).

(وليّ)یش بەمانـای: خۆشویست (مُحِبّ) و، بەمانای مشوورخۆرو، بەمانای هاوكارو، بەمانای پشتگیرو، بەمانای سەرپەرشتییكار، دێ، ئنجا ئافرەتانو پیاوانی بڕوادار دەبێ ئاوا بنو، هەموو ئەو چەمكو واتایانە، لەنێو: ﴿ وَٱلۡمُؤۡمِنُونَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتُ بَعۡضُهُمۡ أَوۡلِيَآءُ بَعۡضٖ ﴾ دا، كۆدەبنەوە.

جـاری وا هەیـە كـە هەسـت دەكـەم برایـەك، خوشـكێك تووشـی گرفتێك بووەو، وەك پێویست لەگەڵیدا هاودەرد نـیم، گلـەیی لـە خۆم دەكەمو، دەڵێم: دیارە ئیمانـەكـەم تـەواو نیـە، ئەگـەرنا خـوا دەفـەرموێ: ئیمانـدارانی پیـاو و ئـافرەت: مشـوورخۆرو دۆسـتو پشـتیوانو خۆشەویسـتو دڵسـۆزی یەكـدین، ئـەویش تووشـی

[1] صحیح مسلم: ٤٣٢، و جامع الترمذي: ٢١١ ، و مسند أحمد: ٤٢٢٢، و السنن الكبرى للنسائي: ١١٢٠٨ .

www.alibapir.net

ئازارێك بووە، تووشی نارەحەتییەك بووە، بەڵام وەك پێویست دڵم بۆی نائێشێ، دیارە ئیمانەكەم تەواو نیە، چونكە هەتا ئیمانت تەواوتر بێ، دۆستایەتی (موالاة)ت بۆ ئەهلی ئیمان باشتر دەبێ، برایەتییو خۆشەویستییو دڵسۆزییو بەتەنگەوە بوونت، بۆیان باشتر دەبێ.

**حوكمی پابەندیی بە بەرنامە و كارنامەوە:**

بەڕێزان! ئێمە كۆمەڵێكین لەسەر بەرنامەیەك كۆبووینەوە: ئەوە پەیڕەوو پڕۆگرامی نێوخۆمانە، ئەوە ئەو بیستو پێنج (٢٥) بنەما شەرعییەن، كە شەرحمان لەسەر كردوون، پاشان ئەوە كارنامە (لائحة)كانی هەر كام لە ئۆگانەكانن، ئایا پابەندیی بەوانەوە تەنیا شتێكی خۆبەخشانەیەو، دەتوانین پابەند بینو، دەشتوانین پابەند نەبین؟ بە دڵنیاییەوە نەخێرو لەو بارەوەش بەڵگە زۆرن، بۆ نموونە:

<u>یەكەم</u>: بنچینەیەكی شەرعییە: هەر شتێك فەرزێك پەكی لەسەر بكەوێ فەرز دەبێ: (مالا یتم الواجب إلا بە، فهو واجب)، ئنجا ئەو ئامانجە شەرعییانەی هەمانن، بۆمان تەحقیق نابن، بەبێ كاری هەرەوەزیی و پێكەوەیی و، ئەو كارەش ناكرێ بەبێ

www.alibapir.net

پابەنـــدبوون بـــە بەرنامـــەو پـــەیڕەو و کارنامەکانـــەوە، بۆیـــە پابەندیی بە بەرنامە و کارنامەوە، فەڕزە.

دووەم: بنچـــینەیەکی شـــەرعییە، ئامڕازەکـــان حـــوکمی ئامانجـەکانیان هەیـە: ( للوسـائل حکـم المقاصـد)، کەواتـە: وەك چـــۆن ئامـــانجی چەســـپاندنی خوابەیـــەکگرتن (التوحیـــد)و دادگـەریی، فـەڕزە، ئـەو ئـامڕازو هۆکـارەش کـە پـەکیان لەسـەری کەوتوە، فەڕزە.

٣) فەرمایشـتی پێغەمبـەرە ﷺ : (المسلمون علـى شـروطهم، إلاّ شرطاً حَرَّمَ حلالاً أو أحلَّ حَراماً). رواه الترمذي: ١٣٥٢ عـن عمـرو بن عوف و صححه الألباني.

واتـــە: مسـولْمانان پابەنـــدن بـــە مەرجـەکانی خۆیانـــەوە، مەگـەر مـــەرجێك حـــەلاڵێکی حـــەڕام کردبـــێ، یـــان حـــەڕامێکی حـــەلاڵ کردبێ.

واتە: لەگـەڵ دەقێکـی شـەرعیی دا دژ بـێ، ئەوکاتـە ئـەو مەرجـە هـیچ ئیعتیبـاری پـێ نـاکرێ، ئەگـەرنا ئـەوەی کـە لەسـەری ڕێـك دەکەوین، دەبێ پێکەوە پێوەی پابەند بین.

ameer.maktab@yahoo.com

 /AliBapir  /AliBapir  /MediaAmeerOffice

www.alibapir.net

www.alibapir.net

٤) (عمر بن الخطاب) خوا لێی ڕازی بێ گوتوویەتی: (الأرض الأرض باته لا إسلام إلا بجماعة، و لا جماعة إلا بإمارة، و لا إمارة إلا بطاعة، فمن سوّده قومهُ على الفقه كان حياة له و لهم، و من سوّدهُ قومة على غير فقه، كان هلاكا له و لهم) سنن الدارمي: ٢٥١ و ٢٥٣ و ٢٥٧.

واته: زەمین بپارێزن و نیشتەجێ بن، چونکە ئیسلامەتیی بە بێ کۆمەڵ بوون نابێ، کۆمەڵبوونیش بەبێ فەرماندەیەتی نابێ و، فەرماندەیەتیش بەبێ گوێڕایەڵیی نابێ، هەر کەس خەڵکەکەی لەسەر بناغەی تێگەیشتن بیکەنە بەرپرسیان، مایەی ژیانە بۆ خۆی و ئەوانیش و، هەرکەسیش خەڵکەکەی بێ ئەوەی شارەزابێ، بیکەنە بەرپرسیان، مایەی فەوتانی خۆی و ئەوانیشە.

٥) بەندە صاڵحەکە لەگەڵ مووسا (علیه السلام)دا مەرج دەگرێ :

﴿ فَلَا تَسْـَٔلْنِى عَن شَىْءٍ حَتَّىٰٓ أُحْدِثَ لَكَ مِنْهُ ذِكْرًا ﴿٧٠﴾ ﴾ الكهف: ٧٠،

هیچ شتێکم لێ مەپرسە، تاکو خۆم بۆت باس دەکەم.

بەڵام مووسا سێ جاران مەرجەکە دەشکێنێ، پاش ئەو سێ جارە، دەڵێ تەواو، گلەیی نامێنێ، چونکە نەیتوانی پابەند بێ بە مەرجەکەوە: ﴿ قَالَ ذَٰلِكَ مَا كُنَّا نَبْغِ فَٱرْتَدَّا عَلَىٰٓ ءَاثَارِهِمَا

www.alibapir.net

قَصَصٗا ﴿٦٤﴾ فَوَجَدَا عَبۡدٗا مِّنۡ عِبَادِنَآ ءَاتَيۡنَٰهُ رَحۡمَةٗ مِّنۡ عِندِنَا
وَعَلَّمۡنَٰهُ مِن لَّدُنَّا عِلۡمٗا ﴿٦٥﴾ قَالَ لَهُۥ مُوسَىٰ هَلۡ أَتَّبِعُكَ عَلَىٰٓ أَن
تُعَلِّمَنِ مِمَّا عُلِّمۡتَ رُشۡدٗا ﴿٦٦﴾ قَالَ إِنَّكَ لَن تَسۡتَطِيعَ مَعِيَ
صَبۡرٗا ﴿٦٧﴾ وَكَيۡفَ تَصۡبِرُ عَلَىٰ مَا لَمۡ تُحِطۡ بِهِۦ خُبۡرٗا ﴿٦٨﴾ قَالَ
سَتَجِدُنِيٓ إِن شَآءَ ٱللَّهُ صَابِرٗا وَلَآ أَعۡصِي لَكَ أَمۡرٗا ﴿٦٩﴾ قَالَ
فَإِنِ ٱتَّبَعۡتَنِي فَلَا تَسۡـَٔلۡنِي عَن شَيۡءٍ حَتَّىٰٓ أُحۡدِثَ لَكَ مِنۡهُ ذِكۡرٗا
﴿٧٠﴾ فَٱنطَلَقَا حَتَّىٰٓ إِذَا رَكِبَا فِي ٱلسَّفِينَةِ خَرَقَهَاۖ قَالَ أَخَرَقۡتَهَا
لِتُغۡرِقَ أَهۡلَهَا لَقَدۡ جِئۡتَ شَيۡـًٔا إِمۡرٗا ﴿٧١﴾ قَالَ أَلَمۡ أَقُلۡ إِنَّكَ
لَن تَسۡتَطِيعَ مَعِيَ صَبۡرٗا ﴿٧٢﴾ قَالَ لَا تُؤَاخِذۡنِي بِمَا نَسِيتُ وَلَا
تُرۡهِقۡنِي مِنۡ أَمۡرِي عُسۡرٗا ﴿٧٣﴾ فَٱنطَلَقَا حَتَّىٰٓ إِذَا لَقِيَا غُلَٰمٗا فَقَتَلَهُۥ
قَالَ أَقَتَلۡتَ نَفۡسٗا زَكِيَّةَۢ بِغَيۡرِ نَفۡسٖ لَّقَدۡ جِئۡتَ شَيۡـٔٗا نُّكۡرٗا ﴿٧٤﴾
۞ قَالَ أَلَمۡ أَقُل لَّكَ إِنَّكَ لَن تَسۡتَطِيعَ مَعِيَ صَبۡرٗا ﴿٧٥﴾ قَالَ إِن
سَأَلۡتُكَ عَن شَيۡءِۭ بَعۡدَهَا فَلَا تُصَٰحِبۡنِيۖ قَدۡ بَلَغۡتَ مِن لَّدُنِّي عُذۡرٗا
﴿٧٦﴾ فَٱنطَلَقَا حَتَّىٰٓ إِذَآ أَتَيَآ أَهۡلَ قَرۡيَةٍ ٱسۡتَطۡعَمَآ أَهۡلَهَا فَأَبَوۡاْ

www.alibapir.net

أَن يُضَيِّفُوهُمَا فَوَجَدَا فِيهَا جِدَارًا يُرِيدُ أَن يَنقَضَّ فَأَقَامَهُۥ قَالَ لَوۡ شِئۡتَ لَتَّخَذۡتَ عَلَيۡهِ أَجۡرًا ﴿٧٧﴾ قَالَ هَٰذَا فِرَاقُ بَيۡنِي وَبَيۡنِكَۚ سَأُنَبِّئُكَ بِتَأۡوِيلِ مَا لَمۡ تَسۡتَطِع عَّلَيۡهِ صَبۡرًا ﴿٧٨﴾﴾

**الكهف: ٦٤ - ٧٨**

**٦) با ئەم فەرمايشتەی پێغەمبەر ﷺ تەماشا بكەين، ئنجا با بزانين تەبايیو ڕێكيی نێوخۆمان، بەپێی ئەم فەرمايشتە، تا چ ڕاددەيەكە: (المسلم أخو المسلم، لا يظلمه ولا يُسْلِمُه، ومن كان في حاجة أخيه، كان الله في حاجته، ومَنْ فرَّج عن مسلم كُربة، فرَّجَ الله عنه بها كُربَة من كُرب يوم القيامة، ومن سَتر مُسلمًا، ستره الله يوم القيامة)[1].**

**واتە: مسوڵمان برای مسوڵمانە، (هەروەها مسوڵمان خوشكی مسوڵمانە)، نەزوڵمی لێ دەكاو، نە تەسليمی دەكا، هەركەسێكيش هاوكاريی برايەكەی خۆی بكا، خوا يارمەتيی دەداو، هەر كەسێك خەمێك، لە مسوڵمانێك بڕەوێنێ، خوا خەمێك لە خەمەكانی قيامەتی لێ دەڕەوێنێو، هەركەسێك مسوڵمانێك بپۆشێ، خوا لە قيامەت دا دەيپۆشێ.**

---

[1] صحيح البخاري: ٢٣١٠، و صحيح مسلم : ٢٥٨٠.

www.alibapir.net

پۆشینی مسوڵمانێك واته: عـەیبی هەیـەو هـەر تـۆ پێـی دەزانـی، بۆیه بیپۆشه، مادام ماف خەڵكێكی دیكـەی پێـوه پەیوەسـت نیـه، بــەڵام ئەگــەر زوڵمــی لــه كەســێك كردبــێ، تــۆ عەیبەكــەی بــۆ بپۆشیو، سـەرەنجام ئـەو لایەنـەی بەرامبـەر مـەزڵووم بـێ، ئـەوه جیایـه، دەبـێ ورد بـین و، وەك پێغەمبـەر ﷺ مەبەسـتی بـووه، ئاوا له فەرمایشتەكانی تێ بگەین، ئەوه ڕاست نیه هەر هەڵەیەك بۆ خەڵك پەردەپۆش بكـەین، بـا هـەقی خـەڵكی دیكەشی لەگەڵ زایه بێ! یاخود با جەمعەكەش زەرەربار بێ، بڵێی با هەر پـەردە پۆشــی بكــەم! نــەخێر نــابێ‌و، ئــەوه نــه دڵســۆزییه بــۆ بابــای خەتابارو، نه دڵسۆزییه بۆ جەمعەكەش، بـەڵكو بۆخۆشـت بـووی بەكەسێك كه هاوكارییت كردوه، لەسەر گوناهو دەستدرێژیی.

ameer.maktab@yahoo.com

 /AliBapir  /AliBapir  /MediaAmeerOffice

www.alibapir.net

www.alibapir.net

## پێنج بنەمای گرنگی کاری بە کۆمەڵ:

ئێمە لەکاری پێکەوەییماندا، پێویستییمان بە چەند بنەمایەك هەیە، پێم وایە گرنگترینیان ئەم پێنجەن:

### ١) ڕێز لە یەكدی بگرین:

پێویستییمان بەڕێزی دووسەرە هەیە، سەروخوار، هەموو لایەك دەبێ ڕێز لەیەكدی بگرین، هەموو مرۆڤێك پێویستیی بە ڕێز لێگرتن هەیە، هەموو مرۆڤێك پێویستی بە تەقدیركران هەیە، بۆیە هەرگیز حاكمانەو ئامیرانە لەگەڵ ئەوانەی كە لەبەر دەستتان دان، یان لەخوار ئێوەوەن، مامەڵە مەكەن، هەمیشە برایانە مامەڵە بكەن.

### ٢) قسەی خۆش‌و ڕووی خۆش‌و گفت‌و لفتی شیرین:

ئینسان دەبێ خۆی لەسەر قسەی شیرین‌و ڕووی گەش ڕابێنێ، لە كتێبێكدا خوێندوومەتەوە دەڵێ: زەردەخەنە پێویستیی بە سێزدە (١٣) ماسوولكە دەكا لەدەم‌و چاودا، (پزیشكەكان زیاتر ئەوە دەزانن) بەڵام كەسێك خۆی مۆڕ بكاتەوە، خۆی گرژ بكات، پێویستی بە هەشتاو حەوت (٨٧) ماسوولكە هەیە! من جارجار بە یەكێك لە منداڵەكانی خۆم دەڵێم: ڕۆڵە گیان! بۆچی ئەو مەسرەفە زۆرە دەكەی! هەشتاو حەوت ماسوولكەت دەجووڵێ،

www.alibapir.net

تاكو خۆت مۆن دەكەی! خۆت ڕووخۆش بكە، بەرامبەرەكەشت پێی خۆش دەبیٚ‌و، بۆخۆشت موڕتاح تر دەبی.

**٣) پێكەوە ڕاوێژ كردن:**

بەڵیٚ بێگومان دەبیٚ خواریٚ بەقسەی سەریٚ بكا، بەڵام سەرەوەش دەبیٚ ڕاوێژ بەخوارەوە بكات‌و سوود لە عەقڵی ببینێت، خواش ڕاوێژ پێكەوەكردنی كردۆتە بناغەی كاروبار بەڕێوەبردنی مسوڵمانان: ( و أمرهم شورى بينهم) الشورى -٣٨-.

بۆ نموونە: پێی بڵیٚ: بە نیازم بڕیارێكی وا بدەم، ئنجا پێش ئەوەی ئەمە ببێتە بڕیار، پێت چۆنە؟ بەتایبەتی كە دەچی بۆ شوێنێك و تۆ شارەزای ئەو شوێنە نی.

**٤) گویٚ بۆگرتن‌و بە قسەكردن (السمع والطاعة):**

بەبیٚ ئەمەش كاری پێكەوەیی و بە كۆمەڵ هەرگیز بەڕێوەناچیٚ، پێشتریش گوتمان: كە (سنن الدارمي) لە (عومەری كوڕی خەتتاب)ەوە هێناویەتی: (لا إسلام بلا جماعة، ولا جماعة بلا إمارة، ولا إمارة بلاطاعة) واتە: ئیسلام بەبیٚ جەماعەت، نابیٚ (مسوڵمانان كۆنەبنەوە، كوا مسوڵمانەتیی لەكویٚ پەیدا دەبیٚ، ئەگەر مسوڵمانان پڕژو بڵاوبن، ئیسلام بەبیٚ كۆمەڵبوونی مسوڵمانان نابیٚ) كۆمەڵبوونی مسوڵمانانیش بەبیٚ گەورایەتیی،

www.alibapir.net

بەبێ فەرماندەیەتی نابێ، فەرماندەیەتیش بەبێ بەقسەکران، (گوێ ڕایەڵیی) نابێ.

وەك جاری دیکەش باس کراوە: جارێکیان مەفرەزەیەکمان بووە، یەکێکیان بەرپرسیان بووە، بەرپرسەکەیان گوتوویەتی: دەچین بۆ فلان شوێن، بەم ڕێیەدا، یەکێکی دیکەیان گوتوویەتی، نەخێر دەبێ لێرەوە بڕۆین، ئەویش گوتوویەتی: ئاخر من ئەمیرم! گوتوویەتی: ڕاستە تۆ ئەمیری بەڵام نابێ، لە قسەم دەربچی! بێگومان نابێ وابێ، بەرپرس دەبێ بەقسەی بکرێ: (إنما جعل الإمام ليؤتمَّ به) ئیمامو پێشەوا، بۆ پێش نوێژیی، دەبێ چاوی لێبکرێ و بکرێتە سەرمەشق..

بەڵام هەمووی هەر خۆی پێ لە ئیمامەکە باشتر بێو، پێی وابێ کە نەخێر منو تۆ فەرقمان نیەو، تۆ دەبێ بە قسەی من بکەی! بێگومان هەرگیز کاری هەرەوەزیی ئاوا ناکرێ.

**٥) دەبێ بە سیفەتە بەرزەکان (فضائل)ەوە پێکەوە مامەڵە بکەین:**

پێم وایە یەکێك لە خاڵە لاوازەکانی لایەنە ئیسلامییەکان لە کاری ئیسلامیی دا، ئەوەیە، کە لەسەرێکەوە: قیادە زیاتر جەختی لەسەر لایەنی گوێگرتنو بەقسەکردن (السمع والطاعة)

www.alibapir.net

کردۆتەوەو، زۆر ئاوڕی نەداتەوە لەوە کە خەڵك فێری داهێنان‌و ڕای خۆ گوتن، بکات – هەڵبەت لە قاڵبی ئەدەب دا – لە سەرێکی دیکەشەوە: لەسەر ئاستی بنکە (قاعدة) هی وا هەیە پێی وایە کاتێك داهێنان دەبێ، کە تۆ لەسەرووی خۆت هەڵگەڕێیەوە! نا، لێی هەڵمەگەڕێوە! تەماشای هاوەڵان بکەن (خوا لێیان ڕازی بێ)، بۆ نموونە: (الحباب بن المنذر) لە جەنگی (بدر)دا دەزانێ کە شوێنەکە – کە پێغەمبەری خوا دیاریی کردوە – باش نیە لەڕووی ستراتیژی جەنگییەوە، بەڵام یەکسەر دەپرسێ: (یارسول الله! ﷺ أهذا منزل أنزلك الله إيّاهِ، أم هي الحرب والرأي والمكيدة؟) واتە: ئەی پێغەمبەری خوا! ئایا ئەمە مەنزڵێکە خوا فەرموویەتی دەبێ لێرە بارگە بخەین، یاخود تاکتیکی جەنگییەو بۆچوونی خۆتە؟ ئەویش دەفەرموێ: (بَلْ هيَ الحرب والرأي والمكيدة)، بەڵکو ئەمە جەنگ‌و تاکتیك‌و بۆچوونی خۆمە؟ ئەویش بۆی ڕوون دەکاتەوەو دەڵێ: ئێرە باش نیەو بەڵگەی بۆ دەهێنێتەوە، پێغەمبەریش ﷺ گوێی بۆ دەگرێ‌و دوایی دەفەرموێ: (لَقَد أشَرْتَ بالرأي)[1]، ڕای ڕاست هی تۆیە، نەك ئەوەی من.

[1] السيرة النبوية لإبن هشام، ج ٢ ص ٣٣٦.

www.alibapir.net

مەبەستم ئەوەیە کە دەگونجێ لەخوارەوە کەسێك شتێك بزانێ‌و، بەرپرسەکەی فیکری پێ نەشکابێ، بەڵام با لە قاڵبی ئەدەبدا بیخاتەڕوو، نەك بە ڕەخنە گرتن‌و، یاخیی بوون‌و سەرپێچیی کردن، کە دوایی ئیشەکە تێك دەچێ‌و، ئەو بەرپرسەش ئەو قسەیەی لێ وەرناگرێ، چونکە زۆرجار حەقیش ئەگەر بەشێوەیەکی ناحەق بخرێتە ڕوو، قبووڵ ناکرێ، هەروەك جاری وایە: ناحەقیش بەشێوەیەکی حەق بخرێتە ڕوو، بەشێوەیەکی جوان، وەردەگیرێ، بەڵام حەقیش بەشێوەیەکی ناڕێك بخرێتە ڕوو، وەرناگیرێ، هەربۆیەش جوان گوتراوە: (أ أمر بالمعروف بالمعروف، وَأْتَهَ عن المنكر لا بالمنكر)، واتە: بەشێوەیەکی پەسند فەرمان بە پەسند بکەو، ڕێگریی لە ناپەسند بکە، بەڵام بەشێوازێکی ناپەسند نا.

ameer.maktab@yahoo.com

 /AliBapir  /AliBapir  /MediaAmeerOffice

www.alibapir.net

www.alibapir.net

## بڕگەی سێیەم: چاوبەخۆداگێڕانەوە لەسەر ئاستی کۆمەڵگا

زۆرجار لەبیرمان دەچێتەوە کە ئێمە نوێنەری ئیسلامێکین، کە قورئانەکەی: بیرخەرەوەی جیهانییان (ذكر للعالمين)ەو، پێغەمبەرەکەشی ﷺ بەزمییە بۆ جیهانییان (رحمة للعالمين)!! هەروەها لەبیرمان دەچێتەوە کە ئێمە نوێنەرایەتیی ئیسلامێك دەکەین، کە هی ئێمە نیە، هی خوایەو بۆ هەموو خەڵکە، بۆ هەموو بەشەر، بۆ هەموو مرۆڤەکان، بۆیە دەبێ لەو بارەوەش بەخۆماندا بچینەوەو، چاو بەخۆماندا بگێڕینەوەو، خۆمان کوشمەڵە نەکەین، خۆمان بچووك نەکەینەوە لەچوارچێوەو قاڵبێکی گچکەداو، پێمان وابێ ئیسلام هەر هی ئێمەیە، یان پێمان وابێ: هەر ئێمە لەسەر حەقین‌و تەنیا ئێمە هەین، ئەو تەعبیرە کە لە سووڕەتی (الأنبياء)دا هاتوە، زۆر سەرنجی ڕاکێشاوم، کە خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ كَتَبْنَا فِي الزَّبُورِ مِنۢ بَعْدِ الذِّكْرِ أَنَّ الْأَرْضَ يَرِثُهَا عِبَادِيَ الصَّالِحُونَ ﴿١٠٥﴾ ﴾ الأنبياء، واتە: بەدڵنیایی لە زەبووردا نووسیومانە، تۆمارمان کردوە (وەك یاسایەکی خۆمان) دوای تەوڕات، {﴿الذِّكْرِ﴾ یانی: تەوڕات}، کە بەندە شایستەکانم زەوی بە میرات دەگرن.

www.alibapir.net

ئێمە هەر وا حاڵیی بووین کە ئەو بەندە شایستانە بریتی بن لە (صاڵحەکان، ئەهلی نوێژو تاعەتو ڕۆژوو و، ئەو جۆرە کەسانە)، کەچی سەیری سەرزەوی دەکەین، بەو تێگەیشتنە بێ، صاڵحەکان هەموویان بێدەسەڵاتو دەستەپاچەن، یان بێ قەوارەی سیاسیین، یان ئەگەر دەوڵەتیشیان هەبن، دەوڵەتی بێ ئیرادەو کلۆڵ کراون!! کێ ئێستا حاکمە لە دنیادا؟ ئەوانەی کە شایستەن، شایستە بەو واتایە کە هۆکارەکانی حوکمڕانییان بۆخۆیان فەراهەم هێناون، یاساکان (سنن)ی خوایان لە گەردووندا بۆخۆیان دۆزیونەوە، هۆکارەکانی هێزو پێزیان لە خۆیاندا هێناونەدی، ئەوانە ئێستا دەستڕۆیشتوو و حوکمڕانن، چونکە تەنانەت پێغەمبەریش ﷺ کە شتێك دەفەرموێ، چ جای خوا کە شتێك دەفەرموێ، نابێ لەگەڵ واقیعدا تێك بگیرێ.

هەروەها لێرەوە ئاماژەیەك دەکەین بەو فەرموودەیەش کە دەفەرموێ: (ما أفلح قوم ولّوا أمرهم امرأة) البخاري: ٢٤٥٦، و النسائي (٤٣/٢) و الحاكم (١١٨/٣)، و أحمد (٤٣/٥).واتە: کۆمەڵێك، ئافرەتێك بکەنە بەرپرسی خۆیان سەرفراز نابن.

یەکێك بۆی هەیە بڵێ: ئەدی (ئەندیرا غاندیی) لە هیندو، (ئەنجیلا میرکڵ)ی ئەڵمانیاو، (گۆڵدا مائیر)ی سەرۆك وەزیرانی ئیسرائیل، و (تاتشر)ی بەریتانیا، ئەو ئافرەتانە وڵاتیشیان

www.alibapir.net

بەڕێوە بردوەو، خەڵكو وڵاتەكانیشیان لێیان بەهرەمەند بوونو، لێیان نەچوونە خەساریێ، وەك زۆربەی هەرەزۆری پیاوە دیكتاتۆرە حوكمڕانەكانی وڵاتانی مسوڵماننشین!!

ئنجا بێگومان: (لن يفلح قوم) مەبەست پێی سوودمەند نەبوونی دنیایی یە، نەك هی قیامەتیی ، چونكە فارسەكان ئەوكاتە ئەهلی دین نەبوون، ئەهلی ئیسلام نەبوون، تاكو بفەرمویێ: بۆ قیامەتێ سەرفراز نابن، بەڵكو یانی: بۆ دنیایان قازانج ناكەن، كەچی هەندێك گەل و نەتەوە قازانجیشیان كردوەو، ئافرەتیشیان كردووەتە كاربەدەست! كەواتە: یان دەبێ بگوترێ: فەرموودەكە وانیە، یان دەبێ بڵێین: مەبەستی پێغەمبەر ﷺ شتێكی دیكەیە.

مەبەستم ئەوەیە دەبێ وریا بین، ئێستا ئەم ئایەتە كە بۆم باس كردن: ﴿أَنَّ ٱلْأَرْضَ يَرِثُهَا عِبَادِىَ ٱلصَّٰلِحُونَ﴾ سەر زەوی عەبدە صاڵحەكانم بە میراتی دەگرن، ئێستا هەرچی عەبدی صاڵحو نوێژكەرو خواناسە، بێ دەسەڵاتە! كەواتە: چەمكی وشەی: (صالح) هەر ئەوەنیە كە ئێمە لێی تێگەیشتووین، بەڵكو(صالح) یانی: شایستە، واتە: ئەوانەی ئەهلییەتیان هەبێ، ئێستا ئەهلی كوفر ئەهلییەتیان هەیە: وڵاتیان بە دامەزراوەكان بەڕێوە دەبەن، یاسا سەروەرەو...هتد، كۆمەڵێك هۆكاری هێزیان

www.alibapir.net

هەن! بەڵێ ئێمە دەبێ لە مامەڵە لەگەڵ غەیری خۆماندا، وریای ئەوە بین، کە خوای زاناو توانا ئەم دنیایەی بەس بۆ ئێمە دروست نەکردوەو، هەر ئێمەی تێدانین، یاساکان (سنن)ی خواش (سبحانە وتعالى) لایەنگریی (إنحیاز)یان تێدانیە بەرامبەر بە ئێمە، ئێمە حەقی ڤیتۆمان نیە لەبەرامبەر سیستەم‌و یاساکانی خوادا.

سەرنج بدەن! لەکاتێکی چەند مەترسییداردا، لە جەنگی ئوحوددا، مسوڵمانان کاتێك بێ فەرمانیی خوا دەکەن، تێکدەشکێن، پێغەمبەر ﷺ ئەو هەموو ئەزیەتەی دەبێ، چونکە حەقی ڤیتۆمان نیە لەبەرامبەر یاساکانی خوادا، خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ لَّيْسَ بِأَمَانِيِّكُمْ وَلَآ أَمَانِيِّ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ ۗ مَن يَعْمَلْ سُوٓءًا يُجْزَ بِهِۦ ﴾(النساء:١٢٣)،واتە: بەخۆزگەو خەیاڵپلاوی ئێوەو خاوەن کتێبان نیە، هەرکەس خراپە بکات، پێی سزادەدرێ... ئەوە بزانین: هەرکەسێك خراپە بکا، سزای دەدرێتەوە، مسوڵمان بێ، یان نامسوڵمان بێ.

بۆ مامەڵەشمان لەگەڵ کۆمەڵگادا، وەك ئەم کارو جموجۆڵە ئیسلامییە، پێویستە چەند بنەمایەك ڕەچاو بکەین:

www.alibapir.net

١) دەبێ دڵسۆزیی‌و بەتەنگەوە بوونمان هەبێ بۆ خەڵك: (الدین: النصیحة...) رواه مسلم: ٥٥.

٢) دەبێ دادگەریی‌و چاكەكاریمان لەگەڵیان هەبێ، لەبواری مامەڵەو هەڵسوكەوت دا:﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يَأْمُرُ بِٱلْعَدْلِ وَٱلْإِحْسَٰنِ وَإِيتَآيِٕ ذِى ٱلْقُرْبَىٰ وَيَنْهَىٰ عَنِ ٱلْفَحْشَآءِ وَٱلْمُنكَرِ وَٱلْبَغْىِ ۚ يَعِظُكُمْ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ ﴿٩٠﴾ ﴾ النحل: ٩٠

٣) دەبێ بانگەواز بۆ چاكەو، فەرمان بە پەسندو ڕێگریی لە ناپەسندیان، لەگەڵدا ئەنجام بدەین:﴿ وَلْتَكُن مِّنكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى ٱلْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ ۚ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿١٠٤﴾ ﴾ آل عمران: ١٠٤

٤) دەبێ هەموو ئەمانەش بە پاڵنەری بەزەیی‌و پەرۆش‌و دڵ پێسووتان، لەسەر بناغەی چی بۆخۆمانمان پێ خۆشە، بۆ ئەوانیشمان پێ خۆش بێ: ( لا یؤمن أحدكم حتى یحب لأخیه ما یحب لنفسه...) رواه البخاري: ١٣، و مسلم: ٤٥. واتە یەكێكتان بڕوا ناهێنن(بڕوایەكی باش)، تاكو چی بۆ خۆی پێی خۆشە، بۆ برایەكەشیی پێی خۆش نەبێ.

www.alibapir.net

هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (.. و أحب للناس ما تحب لنفسك تكن مسلما) رواه الترمذي: ٢٣٠٥، و اللفظ لە، و ابن ماجە: ٤٢١٧، و حسنە الألباني.

واتە: چیت بۆ خۆت پێخۆشە، بۆ خەڵکیش پێت خۆشبێ، دەبیە مسوڵمان(ی باش).

(ابن حجر العسقلاني)ڕوونکەرەوەی (صحیح البخاري) لە شەرحی ئەو فەرموودەیەی پێشێ دا، نووسیویەتی:

(.. و یحتمل أن یکون قوله: (لأخیه) شاملا للذمي أیضا، بأن یحب له الإسلام مثلا)[1]. واتە: دەگونجێ فەرمایشتەکەی، (لأخیه) پەیماندار (هاوولاتیی نامسوڵمان)یش بگرێتەوە، کە بۆ وێنە: ئیسلامەتیی بۆ پێخۆش بێ.

هەروەها سەرچاوەی پێشوو هەمان ڕای لە (علي القاري)یشەوە هێناوە، کە گوتوویەتی: {(قوله للناس) یحتمل التعمیم، و یحتمل التخصیص بالمؤمنین)}[2].

---

[1] موسوعة: فتح الملهم بشرح صحیح الإمام مسلم، ج ١ ص٥٩٤ : للشیخ شبیر أحمد العثماني.

[2] سەرچاوەی پێشوو، هەمان بەرگ و لاپەڕە.

www.alibapir.net

پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) لە بواری مامەڵەو هەڵسوکەوتدا، ئاوابوون، بەلاَم کەدێینە نێو بواری بەرەنگاربوونەوەو دژایەتیی، ئەوە بازاڕێکی دیکە دێتە گۆڕێ.

پێم وایە ئێمە وەك ئیسلامیی زۆر پێویستیمان بەوە هەیە، کە لەبواری مامەڵە لەگەڵ خەڵك‌و کۆمەڵگادا، بەخۆداچوونەوە بکەین‌و، دڵنیاشتان دەکەمەوە، خواو پێغەمبەری خوا ﷺ پێیان خۆشە لەگەڵ هەموو کەس دا ڕاستگۆ بین، بۆ هەموو کەس دڵسۆز بین، لەگەڵ هەموو کەس بەڕەحم بین، چاکەکاربین، هیچ گومانتان لەوەدا نەبێ و، گومانتان لەوەدا نەبێ کە خواو پێغەمبەری خوا ﷺ پێیان خۆش نیە، مسوڵمان ناڕێك بێ، ناڕاست بێ لەگەڵ خەڵکی دیکە، کە بە غەیرەیان دەزانێ، یان نادڵسۆزیان بێ‌و، خراپەیان بۆ بە ئاوات بخوازێ! وانیە، بەڵێ لە بواری شەڕو ڕووبەڕووبوونەوەدا ئەوە جیایە، بەلاَم لەبواری هەڵسوکەوت‌و مامەڵەدا، نابێ هیچ کەس لە مسوڵمان خۆشخوڵقتر بێ، دڵسۆزتر بێ، چاکەکارتر بێ، لێبوردەتر بێ، پێغەمبەری ئێمە ﷺ هەر بەوە گرەوی خۆی بردوەتەوەو، هەر بەوەش وایکردوە هەمیشە خەڵك منەتباری بێ، لە مەککە چی لێ نەکرا؟! بەلاَم دوای ئەوە کە دەسەلاَتی بوو لە مەککەدا، دەبینین پێغەمبەر ﷺ چەند بەدڵ گەورەیی ڕەفتاری کردو،

www.alibapir.net

بەدیلەکانی فەرموو: (اذهبوا فأنتم الطلقاء)واتە: برۆن بەرهەڵدا و دەستکراوەن، ئنجا بۆ زانیارییتان! (طلقاء) یانی: بەرهەڵداکان، نەیفەرمووە: (أحرار)، چونکە: کۆیلە نەبوون‌و، ئازاد بوون، (طلیق) پێچەوانەی (أسیر)ە ، یانی: دیل نین، بڕۆن ئازادن، بۆ کوێ دەچن، بچن، نەك ئازاد بەمانای پێچەوانەی کۆیلە، بۆیە فەرموویەتی: (اذهبوا فأنتم طلقاء)[1]، یانی هەر لەسەر ئەو کوفرەی خۆشتان بن‌و بڕۆن، نەیفەرمووە: وەرن مسوڵمان بن، چونکە مسوڵمانەتیی، قەناعەتە، تەنانەت (صفوان بن أمیة) کە دوایی پێغەمبەر ﷺ بۆ جەنگی (حنین) داوای چوارسەد (٤٠٠) زرێ ی لێ دەکا، دەفەرموێ: ئیشم پێیەتی، ئەویش دەڵێ: لێم دەستێنی، یاخود وەك ئەمانەت؟ دەفەرموێ: وەك ئەمانەت لێت وەردەگرم[2]، لە حاڵێك دا کە مسوڵمانیش نەبووە.

دوایی هەندێکیان کە مسوڵمانیش نەبوون، یەکی هەزار سەر مەڕ، یان سەد حوشتریان دەداتێ، سەد حوشتری ئەوکاتە وەك سەد ئۆتۆمۆبیلی دوایین مۆدیلی نوێی ئێستا وابووە! مسوڵمانیش نەبوون، بۆ ئەوەی بزانن کە ئیسلام دڵیان ڕادەگرێ، کە دوایی پێغەمبەر ﷺ وەك ڕوونکردنەوە و دڵدانەوەی پشتیوانەکان

---

[1] السیرة النبویة لابن هشام : ج ٤ ص ٢٤٣ ، ط ٢٠٠٦ م ، دار ابن الهیثم.

[2] هەمان سەرچاوە ، ج ٤ ص ٢٥١ .

www.alibapir.net

(أنصار) كە دڵیان گەردی گرتبوو، فەرمووی: تۆزێك لە چڵكی دنیا دڵی ئەوانەم پێ ڕاگرت، دڵی ئەوانەم پێ خۆش كرد، تەماشای پێغەمبەر ﷺ بكەن، چەند دووربین بووە! بۆچی ئەو سامانەی بەوانەدا؟ چونكە هەركامێك لەوانە خەڵكێكی زۆری ڕەش‌و ڕووت‌و هەڵخەڵەتاوی بەدەورەوە بوو، وەك ئەو حیزبە عەلمانییانەی ئێستا! زیاتر لەبەر ئەوانی بووە و لە دڵی خۆیدا فەرموویەتی: ئەگەر دڵی ئەوانە ڕاكێشم، خەڵكە ڕەش‌و ڕووتەكە سەنگەرم لێ ناگرن‌و، چی دیكە نابنە سووتەمەنی.

جارێك یەكێك لەو نەزانانە لە مەجلیسی پێغەمبەر ﷺ دەبێ، كە دایكمان عائیشەش، لەوێ دەبێ‌و، جارێ هاوسەرانی پێغەمبەر نەخراونەتە پشتی پەردەوە، كابرا دەڵێ: ئەی موحەممەد! ئەوە چی تۆیە؟ دەفەرموێ: ئەوە خێزانمە، دەڵێ: ئەوە قابیلی تۆ نیە، من ئافرەتێكم هەیە، جوانترین ئافرەتی عەرەبانە، ئەوی دەدەم بەتۆ! ئەویش دەفەرموێ: نەخێر (ئەوە ناكەم)، دوایی كە دەڕوا، عائیشە دەڵێ: ئەی پێغەمبەری خوا! ئەوە كێ بوو؟ دەفەرموێ: (هذا الأحمق المطاع في قومه)[1] واتە: ئەمە كەودەنێكی فەرمانبەریی بۆ كراوە لە نێو خەڵكەكەیدا.

---

[1] سير أعلام النبلاء ، للذهبي، ج٢ ص ١٦٧.

www.alibapir.net

مەبەستم ئەوەیە کە پێغەمبەر ﷺ هەندێك شتی کردوە، وەك مودارا‌و ساچاندن‌و ڕەچاوکردنی واقیع، ئێمەش وەك ئەو کارە ئیسلامییە، پێویستیمان بەو شتانە دەکات‌و، دەبێ وردە ئەندامانی خۆمان حاڵیی بکەین‌و، عەقڵیان، دڵیان فراوان بێ، بۆ مامەڵە لەگەڵ دەرەوەی خۆمان، دەبێ زۆر عەقڵ فراوان‌و دڵ گەورە بین، ئەگەرنا ناتوانین ئەم کارە ئیسلامییە، ئەم پڕۆژە ئیسلامییە وا فراوان بکەین، ببێتە جێی ئومێدی خەڵك‌و، گرفت‌و کێشەکانی کۆمەڵگاو، خەڵك‌و دەوروبەری خۆمانی پێ چارەسەر بکەین.

ameer.maktab@yahoo.com

 /AliBapir  /AliBapir  /MediaAmeerOffice

www.alibapir.net

لە گێڕراوەیەك دا هاتوە ئەمە کەسێکە ئەگەر تووڕە بێ، هەزار (١٠٠٠) کەس لە خەڵکەکەی، شمشێرەکانیان لە کالانیان دەردەکێشن و دەڵێن: کێ بکوژین؟!

www.alibapir.net



# دە (١٠) سەرنج لەبارەی نێومرۆك و چۆنیەتی كاری ئیسلامییەوە

بەڕێزان! لەم تەوەرەیەدا دە (١٠) تێبینیو سەرنج دەخەمەڕوو لەبارەی نێومرۆك و چۆنیەتی ئەنجامدانی كاری ئیسلامییەوە، ئەوانەش تێبینیو سەرنجی خۆمن، لە ئەنجامی ئەزموونم لەنێو كارو كاروانی ئیسلامیی داو، لە ئەنجامی خوێندنەوە و تێفكرینی خۆم لە كاروپرۆژەی خۆمانو غەیری خۆمان دا، پێیان گەیشتووم:

**سەرنجی یەكەم:** كاری ئیسلامیی بەشێكە لە مسوڵمانەتیی، نەك بەدیلی بێ:

كاری ئیسلامیی بەشێكە لە دینداریيو مسوڵمانەتیی، نەك بەدیلی بێ، ئنجا ئەمە پێویستیی بەڕوونكردنەوەیەو، هەوڵدەدەم لەبەرتیشكی ئەم ئایەتە موبارەكەدا، ڕوونی بكەمەوە: ﴿ وَلْتَكُن مِّنكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى الْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ ۚ وَأُولَٰئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ ﴿١٠٤﴾ ﴾( آل عمران:

www.alibapir.net

١٠٤) ، واته: با له ئێوەدا با كۆمەڵێك هەبن، (یان ئێوە كۆمەڵێك بن)[1] بانگەواز دەكەن بۆ چاكە، فەرمان دەكەن بە پەسندو، ڕێ دەگرن لە ناپەسندو، هەر ئەوانەش سەرفرازن.

مەبەستم ئەوەیە: هەندێكمان وا دەزانین ئەو كارە ئیسلامییەی كە دەیكەین، بەدیلی مسوڵمانەتییە، لە حاڵێكدا كە ئەوە بەرهەمی مسوڵمانەتییە، یانی: پێشێ دەبێ مسوڵمان بین: ئەهلی ئیمان بین، شارەزاو بەرچاو ڕوون بین، ئەهلی عیبادەتو تەقوا بین، ئەهلی تەزكیە بین، خاوەنی ڕەوشتو ئاكاری بەرزبین، ئنجا دەتوانین كاری ئیسلامیی بكەین، هەڵبەتە مەبەستم ئەوە نیە، وەك هەندێك لە ئەهلی تەسەووف گوتوویانە: دەبێ مرۆڤ نەفسی تەزكیە بێتو، ببێتە پێشەواو مورشیدی كامڵ، ئنجا دەست پێ بكات! بەڵكو پێم وایە مرۆڤ لەمیانی كاردا، زیاتر تێدەگاتو پێ دەگات، بەڵام مەبەستم ئەوەیە كە ئەم كارە ئیسلامییەی ئێمە، بەدیل نیە بۆ دینداریی‌و مسوڵمانەتیی! پێمان وابێ لەبەر ئەوەی كاری ئیسلامیی دەكەین، ئەوە شەفاعەتمان بۆ دەكا، ئەگەر لەڕووی ئیمان‌و عەقیدەوە، لەڕووی عیلم‌و مەعریفەتەوە، لەڕووی عیبادەتو تەقواوە، لەڕووی هەڵسوكەوتو ڕەوشتەوە، كەمتەرخەم بین، كارو چالاكیی

[1] بەپێی جۆری (من)ی سەر (منكم) ئەگەر بۆ (تبعیض) بێ، یان بۆ (بیان).

www.alibapir.net

ئیسلامیی قەرەبووی ئەوانەمان بۆ دەكاتەوە! بەڵكو بە پێچەوانەوە: كاری ئیسلامیی بە كەسانێك ئەنجام دەدرێ، كە پێشتر لە زاتی خۆیاندا: مسوڵمانێكی ڕێك و پێك و باش بن، وەك زۆرجاران گوتوومە: پاكسازیی بە پاكان دەكرێ و، چاكسازیی بە چاكان دەكرێ و، ڕاستكردنەوە بە ڕاستان دەكرێ و، ئەگەر بۆ خۆت صالح نەبی، چۆن كۆمەڵگا ئیصلاح دەكەی؟!

هەندێك جار وام دێتە بەرچاو: هەندێكمان تەنیا بەوەندە كە ئینتیمامان هەیە بۆ لایەنێكی ئیسلامیی، پێمان وایە ئەوە شەفاعەتمان بۆ دەكا، وەك چۆن هەندێك لەوانەی كە شێخ و سەییدن و پێیان وایە: چونكە بە درەختیی ڕەچەڵەك (شجرة النسب) دەچنەوە سەر پێغەمبەر ﷺ، ئەوە لە هەموو تاوان دەیانپەڕێنێتەوە! هەروەها هی وا هەیە پێی وایە: چونكە ناوی مسوڵمانی لەسەرە، ئەوە تازە حەقی ڤیتۆی هەیە و، هەر (مسوڵمان) بۆخۆی چاكترە لە (نامسوڵمان)، با هیچ جیاوازییشیان نەبێ! بەڵام خوای دادگەر دەفەرموێ: ﴿ لَّيْسَ بِأَمَانِيِّكُمْ وَلَآ أَمَانِيِّ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ ۗ مَن يَعْمَلْ سُوٓءًا يُجْزَ بِهِۦ وَلَا يَجِدْ لَهُۥ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَلِيًّا وَلَا نَصِيرًا ﴿١٢٣﴾ ﴾ (النساء: ١٢٣)، واتە: بەخۆزگە خواستنی ئێوەو خاوەن كتێبەكان نیە، هەركەس خراپەیەك بكات، سزای دەدرێتەوە، (كەس حەقی ڤیتۆی نیە

www.alibapir.net

لەبەرامبەر خوادا)، دواییش لەبەرانبەر خوادا، هیچ دۆستو پشتیوانێکی نابێ.

بەڵێ زۆر گرنگە بۆ ئێمە کە بزانین: کاتێك دەتوانین کارێکی ئیسلامیی باشتر بکەین، کە خۆمان مسوڵمانێکی باشترو دیندارێکی ساغتر بین، لەهەمووڕوویەکەوە: بووناسییو ئیمانو عەقیدەو، عیبادەتو، تەقواو تەزکیەو، ئاکارو هەڵسوکەوتو، تا دوایی.

**سەرنجی دووەم:** تێپەڕاندنو بەزایەدان، دووڕووی دزێوی لادانن لە ڕاستەڕێ:

بەڵێ هەم تێپەڕاندن خراپە، هەم بەزایەدان، (إفراط) ئەوەیە کە لە سنوورەکانی شەرع تێپەڕێنیو، (تفریط)یش ئەوەیە کە نەگەیە سنوورەکانی شەرعو کورتی بێنی.

خوای کاربەجێ لە سووڕەتی (هود) ئایەتی (١١٢)دا دەفەرموێ: ﴿ فَٱسۡتَقِمۡ كَمَآ أُمِرۡتَ وَمَن تَابَ مَعَكَ وَلَا تَطۡغَوۡاْ ﴾ (هود: ١١٢)، واتە: خۆتو ئەوانەی لەگەڵت گەڕاونەوە (فەرمانتان پێکراوە:) ڕێك بوەستن، (واتە: شەریعەت چۆن دەڵێ، ئاوا ڕەفتار بکەن) ﴿ وَلَا تَطۡغَوۡاْ ﴾ تێمەپەڕێنن، سنوورشکێنیی مەکەن.

www.alibapir.net

هەندێك كەس وا دەزانن كە تەنیا كورتهێنان خراپە، نەخێر تێپەڕاندنیش هەر خراپە، شەریعەت چ لێی بەجێ بمێنیو كورتی بێنی، چ زێدەڕۆیی بكەی و لێی تێپەڕینی، هەردووكیان خراپن، ئێستا ئەو گرووپانەی كە پەڕگیرو سەرەڕۆن، وەك چۆن خەڵكێكی دیكە شلگیرو سستو تەنبەڵو، كەمتەرخەمە لە دینداریيدا، ئەوانەش كە تێ دەپەڕێنن، هەردووكیان هەر زیانیان هەیەو، هیچیان ئەوە نین كە شەریعەت دەیەوێ، پێغەمبەریش ﷺ فەرمایشتەكەی زۆر جێی سەرنجە، كە ئەو نەفەرانەی هاتوون بۆ ماڵیانو، لەبارەی عیبادەتو طاعەتی پێغەمبەرەوە، پرسیاریان كردوەو، دوایی یەكێكیان گوتی: من شەو هەر شەونوێژ دەكەمو، ئەوی دیكە گوتی: من هەموو ڕۆژێ هەر بەڕۆژوو دەبمو، ئەوی دیكەش گوتی: من هاوسەرگیریی ناكەم، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی:

( لكنيَّ أصوم وأُفطر، وأُصلي وأرقد، وأتزوّج النساء، فمَنْ رغِبَ عن سنتي، فليس مني)[1] واتە: بەڵام من ڕۆژووش – هی سوننەت – دەگرمو ڕۆژی وایە ناشیگرم (نەك بێ پسانەوە هەر بەڕۆژووبم)، هەروەها شەونوێژیش دەكەمو دەشخەومو، ژنانیش دێنمو، هەركەسێكیش لەڕێبازی من لا بدات، لەمن نیە.

---

[1] صحيح البخاري : ٥٠٦٣، و صحيح مسلم : ١٤٠١ .

www.alibapir.net

کەواتە: ئەگەر بەباری تێپەڕاندنیشدا، لەڕێبازی پێغەمبەر ﷺ تێپەڕێنی، هەر لادانەو، هەر تێکدانی جوانییو ڕەونەقو هاوسەنگیی شەریعەتە.

**سەرنجی سێیەم:** نابێ بەهۆی حەقی هیچ کەسێکەوە، یان هیچ لایەنێکەوە ناحەقییەکەشی قبووڵ بکەین، هەروەها نابێ بەهۆی ناحەقیی هیچ کەسو لایەنێکیشەوە، حەقەکەشی ڕەت بکەینەوە:

ئێمە زۆر جار وا دەکەین، ئێستا بۆ وێنە: ئەمریکا، ئەوە زلهێزێکە، هەروەها ڕووسیا، دیسان چین، ئەوانە بە دڵنیاییەوە ئەهلی کوفرن، بەڵام کە ئەهلی کوفرن، مانای وانیە: شتی چاکیشیان نیە، شتی زۆر چاکیشیان هەیە، ئێمەش خۆمان هەرچەندە ئەهلی ئیسلامین، بەڵام کە ئەهلی ئیسلامین، مانای وانیە، هەڵەو کەموکوڕییمان نین، زۆر گرنگە عەقڵ و دڵی خۆمان وا لێ بکەین: کەسێك کە حەقێکی پێیە، بەهۆی حەقەکەیەوە، ناحەقییەکەشی لێوەرنەگرینو، بۆی نەکەینە هەق، هەر لەبەر ئەوەی کە حەقی پێیە، یان لەبەر ئەوەی ئەهلی ئیسلامەو، ئینتیمای هەیە بۆ دینەکەمان، چاوپۆشیی بکەین لە هەڵەکەشی، هەروەها کەسانێکیش کە ناحەقییان

www.alibapir.net

هەیە، بەهۆی ناحەقییەکەیانەوە، حەقەکەشیان ژێر لێو نەخەین، خۆمان تووشی بێ ئینسافیی بکەین.

وەك خوای کاربەجێ لە سوورەتی (المائدة)، ئایەتی (٨)دا، دەفەرموێ: ﴿ وَلَا يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَـَٔانُ قَوْمٍ عَلَىٰٓ أَلَّا تَعْدِلُوا۟ ۚ ٱعْدِلُوا۟ هُوَ أَقْرَبُ لِلتَّقْوَىٰ ۖ ﴾ المائدة: ٨، واتە: با ڕق هەڵستانتان لە کۆمەڵێك، واتان لێ نەکات، نادادگەر بن، دادگەربن، ئەوە لە پارێزکارییەوە نزیکترە.

هەمیشە بەچاکی خەڵك بڵێین: چاك و، بەخراپیان بڵێین: خراپ، ئنجا ئەوەش بە زارەکیی ئاسانە، بەڵام بە کردەوە وا بکەی، بێگومان ئاسان نیە.

هەروەها خوای دادگەر لە سوورەتی (النساء)، ئایەتی (١٣٥)دا دەفەرموێ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ كُونُوا۟ قَوَّٰمِينَ بِٱلْقِسْطِ شُهَدَآءَ لِلَّهِ وَلَوْ عَلَىٰٓ أَنفُسِكُمْ ﴾ النساء: ١٣٥، واتە: ئەی بڕوادارینە! زۆر بەدادگەریی بەڕێوە بچن و، بۆ خوا شایەدیی بدەن، ئەگەر بەزیانی خۆشتان بێ، دوایی لەدرێژەی ئایەتەکەدا باس دەکات دەفەرموێ: ﴿ فَلَا تَتَّبِعُوا۟ ٱلْهَوَىٰٓ أَن تَعْدِلُوا۟ ۚ ﴾ النساء: ١٣٥، واتە: بەدوای ئارەزوو مەکەون، بۆ ئەوەی دادگەربن.

www.alibapir.net

**سەرنجی چوارەم:** نابێ دژایەتیی ئەهلی کوفر بۆمان، ببێتە پەردەو کۆسپی ڕێی، سوود وەرگرتنمان لە شتە باشەکانیان:

ئێمە وەك ئەهلی ئیسلام لەم هەرێمی کوردستانەدا، لە عێراقدا، لەو وڵاتانەی دیکەی مسوڵمانشین دا، دیارە زلهێزانێك چۆن وڵاتانی ئێمەیان کردووەتە شوێنی تەراتێنی خۆیان، بەتایبەتی ئەمریکاو جوولەکەو ڕووسیاو هەندێك لەوڵاتانی ئەوڕووپا، ئنجا دەبێ وریا بین! ئەو تاڵانکاریی و پاوانخوازییە، کە دوژمنان و ناحەزانی ئیسلام و، مسوڵمانان بەرامبەرمان دەیکەن، وامان لێ نەکات: پەردەو نێوانێکمان بخاتە بەرچاوو، ڕێگربێ کە شتە باشەکانیان لێ وەربگرین ، ئەمەش تۆزێ دەچێتەوە نێو ئەوەی پێشوو، بەڵام لە مونتەڵەقێکی دیکەوە هێناومە.

ئەوە ڕاستییەکە: ئەگەر مرۆڤ بەو وڵاتانەدا بگەڕێ، شتی باشیان زۆر لێ دەبینێ، کە شتە باشەکانیان هیچ پەیوەندیان بە کوفرەکەیانەوە نیە، هەروەك شتە خراپەکانی ئێمەش، پەیوەندیی بە ئیسلامەکەمانەوە نیە، ئێمە ئەگەر لەگەڵ ئیسلامدا ڕاست باین، نەدەبوو وابین.

بۆ ئەهلی کوفریش: خوا بەشەری وا خوڵقاندوە، عەقڵێکی باشی داوەتێ و، فیطرەتێکی ساغی داوەتێ، ئنجا ئەو عەقڵ و

www.alibapir.net

فیطرەتەش وەك چۆن شەریعەت ئینسان ڕێنمایی دەكا، عەقڵی سەلیم‌و فیطرەتیش، تا ڕاددەیەك ئینسان ڕێنمایی دەكەن، وەك خوای پەروەردگار ئاماژەی پێداوە: ﴿ فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفًا ۚ فِطْرَتَ اللَّهِ الَّتِي فَطَرَ النَّاسَ عَلَيْهَا ۚ ﴾ الروم: ٣٠.

هەروەها پێغەمبەریش ﷺ ئاماژەی پێداوە: (كل مولود یولد علی الفطرة فأبواه یُهوِّدانه، أو ینصِّرانِه، أو یُمجِّسانه...)[١]، كە بێگومان مەبەست تەنیا ئەوەنیە كە مرۆڤ (خواناس) بێ، بەڵام پێغەمبەر لێرەدا نموونەی بە خواناسیی هێناوەتەوە، ئەگەرنا فیطرەت: دادگەریی دەخوازێ، ڕاستیی، پاكیی، چاكیی، دەخوازێ.

بەڵێ زۆر گرنگە هەستیارییمان بەرامبەر بەو ستەم‌و خراپەیەی، كە ئەو زلهێزانە لێمان دەكەن، پەردەیەك دروست نەكات لەبەردەمماندا، خۆمان بێبەش بكەین لەو شتە چاكانەی كە دەگونجێ لێیان فێر بین.

تەماشابكەن! پێغەمبەری خاتەم ﷺ، - وەك لە (صحیح البخاري و صحیح مسلم)[٢]دا هاتوە- كاتێك دەیەوێ نامە بنووسێ بۆ (كیسرا)ی فارس و (هیرەقل)ی ڕۆم، یەكێ لە مەجلیسەكە

---

[١] صحيح البخاري: ٥٨٧٥ ، و صحيح مسلم : ٢٠٩٢، و النسائي في سننه: ٥٢٠١ .

[٢] صحيح البخاري: ١٣٣٠ ، و صحيح مسلم: ٢٦٥٨ .

www.alibapir.net

دەبێت، دەڵێ: ئەی پێغەمبەری خوا ! ﷺ ئەو پادشایانە عادەتیان وایە، نامە ئەگەر مۆرنەکرابێ، نایخوێننەوە، ئەویش نافەرموێ: ئەوە دروست نیە و تەقلیدی فارس‌و ڕۆمە! بەڵکو دەفەرموێ: مۆرێکم بۆ دروست بکەن! چونکە ئەو عورفە، تێکگیرانی نیە لەگەڵ دەقێکی شەرعییدا، مادام مەسڵەحەتێك دابین بکات، کە بریتیە لەوەی، بزانرێ: ئەو نامەیە ئەو کەسە ناردوویەتی‌و، تەزویر نەکرێ، مۆرێکی بۆ دروست دەکەن.

هەروەها عومەر (خوا لێی ڕازی بێ) کە لەسەردەمی ئەودا دەوڵەتی ئیسلامیی زۆر فراوان بوو، کۆمەڵێك داهێنانی ئیداریی کردن، بە بەهرە وەرگرتن لە دەوڵەتانی: فارس‌و ڕۆم‌و، هیچ گرفتیشیان نەبوو.

گرنگە حەق‌و چاکەو بەرژەوەندیی لەهەر جێیەك بێ، لەلای هەرکەسێکەوە بێ، ئێمە بە هی خۆمانی بزانین، وەك خوای بەرزو مەزن فەرموویەتی:﴿ .... فَبَشِّرۡ عِبَادِ ﴿١٧﴾ ٱلَّذِينَ يَسۡتَمِعُونَ ٱلۡقَوۡلَ فَيَتَّبِعُونَ أَحۡسَنَهُۥٓۚ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَىٰهُمُ ٱللَّهُۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمۡ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ ﴿١٨﴾ ﴾ الزمر

واتە: موژدە بەو بەندانەم بدە، کە بە گرنگیی پێدانەوە، گوێ لە هەموو قسەیەك دەگرن (ئنجا پاش هەڵسەنگاندن) شوێن

www.alibapir.net

باشترینی دەکەون، ئا ئەوانە خوا ڕێنمایی کردوونو، ئا ئەوانەن خاوەن عەقڵان.

فەرموودەیە دەفەرموێ، یاخود ئەثەرێکە لە (سنن الترمذي)دا هاتوە، هەرچۆن بێ، ماناکەی ڕاستە، ئەگەر لەڕووی سەنەدەکەشیەوە ئیشکال هەبێ: (الحكمة ضالة المؤمن، فحيث وجدها، فهو أحق بها)[1]. واتە: (حكمة) (شتی بەسوودو بەکەڵكو پەسند، لە قسەو کردەوە)، ونبووی مرۆڤی بڕواداره، لەهەر شوێنێك بیدۆزێتەوە، لە هەموو کەس زیاتر مافی پێوەیە.

**سەرنجی پێنجەم**: لابردنی کۆسپو پەرچەکانی بەردەم، کارلێکمان لەگەڵ کۆمەڵگاو دەوروبەرمان دا

بەڵێ: خوشكو برا بەڕێزەکانم! هەر شتێك بوو بە پەرچو کۆسپ لەبەردەم کارلێکی ئێمە لەگەڵ دەوروبەرو کۆمەڵگای خۆماندا، با ئەو کۆسپو پەرچە لابەرین، با لەوبارەوە سێ نموونەتان بۆ بێنمەوە:

١) پێغەمبەر ﷺ بە دایکمان (عائشة) خوا لێی ڕازی بێ، دەفەرموێ: (لولا أن قومَكِ حديث عهدِهم بكفرٍ لَنقضْتُ الكعبة

---

[1] رواه الترمذي: ٢٦٨٧، و السيوطي في الجامع الصَّغيري: ٦٤٦٢، و حَسَّنَه.

www.alibapir.net

فجعلت لها بابين)[1]، ئەم فەرمایشتە هۆی گوتران (سبب الـورود)ی هەیەو دەبێ ڕوون بکرێتەوە:

کاتی خۆی لافاوێك هاتوە لە کەعبەی داوەو ڕووخاندوویەتی، کاتێك قوڕەیش دروستیان کردووەتەوە، ئیمکانیەتو پارەیان کەم بووەو، بۆیان نەکراوە کە لەسەر بناغەی ئیبڕاهیم (علیه السلام) دایبنێنەوەو، کەعبەیان تۆزێك گچکە کردۆتەوە، وەك پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إن قومكِ قصَّرَتْ بهم النفقة)[2]، ئنجا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: لەبەر ئەوەی خەڵکەکەت تازە لە کوفرەوە هاتوون بۆ ئیسلامو ئیمان، ئەگەرنا کەعبەم هەڵدەوەشاندەوە ( دەمخستەوە سەر بناغەی ئیبڕاهیم) دوو دەرگام بۆ دادەنان.

واتە: بەڵام بۆیە دەستی لێنادەم نەوەك گرێو ئیشکالێکی فیکرییان بۆ دروست بێت، وەك لە ڕیوایەتی دیکەدا هاتوە: (.. ولولا أن قومك حديث عهدهم في الجاهلية فأخافُ أن تنكِرَ قلوبُهُم..) صحيح مسلم: ٢٢.

ameer.maktab@yahoo.com

 /AliBapir  /AliBapir  /MediaAmeerOffice

www.alibapir.net

[1] صحيح البخاري: ١٢٦ .

[2] صحيح البخاري: ١٥٨٤ .

www.alibapir.net

٢) پێغەمبەر ﷺ کە هەندێك لەو موونافیقانەی ئیعلانی کوفری خۆیانو دژایەتیی خۆیانیان کردوە، بەرامبەر بە ئیسلام -ئەگەرنا لەسەر نیفاق خەڵك ناکوژرێو شتێکی پەنهانە- سەرەنجام: موستەحەقی ئەوەبوون کە بە کوشتن سزا بدرێن، پێغەمبەر ﷺ وەك پاساودانەوەی نەکوشتنیان، کە ڕەواش بووە بکوژرێن، نەك لەسەر کوفرەکەیان بەڵکو لەسەر دژایەتییەکەیان بۆ ئیسلام و مسوڵمانان، فەرموویەتی: (لا یتحدث الناس أنه کان یقتل أصحابَهُ) رواه البخاری: ٣٥١٨، و مسلم: ٢٥٨٤، واتە: بۆیە نایانکوژم تاکو نەگوترێ موحەممەد هاوەڵەکانی خۆی دەکوژێ!

یانی چی؟ یانی بۆ ئەوەی دەنگۆی خراپ لەدژی ئیسلام و مسوڵمانان دروست نەبێ، پێغەمبەرﷺ چاوپۆشیی دەکا لە جێ بەجێ کردنی ئەو سزا شەرعییە، نەك بەسەر موونافیقاندا، بەڵکو بەسەر ئەوانەدا کە ئیعلانی دژایەتییان کردوە بەرامبەر بە ئیسلامو مسوڵمانان و، لە سایەی دەوڵەتی ئیسلامییش دابوون.

٣) عومەری کوڕی خەتتاب (خوا لێی ڕازی بێ)، (بنو تغلب) هەبوون، تیرەیەکی عەرەب بوون، نەصرانیی بوون، دەبوایە سەرانە بدەن، گوتیان: ئێمە بەناوی سەرانە (جزیة) نایدەین و، ناوی لێ بنێن زەکات (صدقة) و بۆمان دووقات بکەنەوە، بەلام

www.alibapir.net

بەناوی سەرانەوە نایدەین!. عومەر (خوا لێی ڕازی بێ) گوتی: لێیان وەربگرن، دوایی گوتی: (هؤلاء قوم حمقى رضوا المعنى وأبوا اللفظ)، واتە: ئەوانە کۆمەڵێکی کەودەنن، بەمانایەکە ڕازین، بەڵام لەفزەکەیان قبووڵ نیە، قەیناکات بەناوی سەدەقەوە لێیان وەربگرن[1].

نەچووە بڵێ: وشەی (جزیة) ﴿ حَتَّىٰ يُعْطُوا الْجِزْيَةَ ﴾ (التوبة: ٢٩ )، وشەیەکی قورئانییە، چۆن نەبێ؟! بەڵام بێگومان بەو کارە هیچ وشەیەك لە قورئاندا دەستکاریی ناکرێ، تەنیا ئەوان دەڵێن: ناوی لێ مەنێن (جزیة) و ناوی لێ بنێن (صدقة)، گرنگ ئەوەیە مافەکە بدرێ و ئامانجەکە بێتەدی.

لێرەدا دەمەوێ بگوازمەوە بۆ مەسەلەیەك: ئایا پاشگری (ئیسلامیی) تاکو چەند بوون یان نەبوونی پێویستە؟! لە تەوەری یەکەم دا باسم کرد، کە من دیراسەی زۆربەی هەرە زۆری لایەنە ئیسلامییەکانی ئەم ڕۆژگارەم کردوە، هەر لە هیندو پاکستانەوە تاکو دەگاتەوە مەغریب، بە وردیی دیراسەم کردوون، زۆریان پاشگری ئیسلامییان لەسەر بووە، دوایی ناوەکەیان گۆڕیوە، ئنجا پێم وایە ئەو پاشگریی ئیسلامییە،

---

[1] المحلى لابن حزم الأندلسي، ج ٦ ص ١١٣.

www.alibapir.net

ئەگەر نەیهێڵین (نەك لە لای خۆمەوە عەزمم جەزم كردبێ، ئەوە ڕاوێژكردنە و بیرۆكەیە پێشنیاری دەكەم دوای دیراسە و تاووتوێكردن) پێم وایە ئەگەر ناوەكەمان بگۆڕین، باشتر كارلێك دەكەین لەگەڵ خەڵك و كۆمەڵگادا و فراوانتر دەبین، خەڵك زیاتر نزیك دەبێتەوە، لە پەیامەكەمان، لە بەرنامەكەمان، نەك بۆ ئەوەی بەرنامەكەی خۆمان لەگەڵ خەڵكی دا بگونجێنین، بەڵكو بۆ ئەوەی خەڵك زیاتر ئومێد و متمانەی بە كارەكانمان هەبێ، ئەگەر كەسێك ئەو ناوەی لێ بووە بە كۆسپ و پەردە و نێوانێك و، لەبەر ئەو ناوە ناتوانێ لێمان نزیك بێتەوە، با ئەو پەردە و نێوانە لابەرین، ئایا دەوڵەتەكەی پێغەمبەر ﷺ دەزانن ناوی چی بوو؟ ناوێكی تایبەتیی نەبووە، ئایا پێیان گوتوە: (دولة رسول الله)؟ یان (دولة نبي الله)؟ نەخێر، تەماشای مێژوو بكەن!

یان ئایا پێتان وایە دەوڵەتی خەلیفە ڕاشیدەكان، ناوی: (دولة الخلفاء الراشدین) بووە؟! نەخێر، هەر دەوڵەت بووەو تەواو، قەوارەی سیاسیی بووە، تەنانەت دەوڵەتی ئومەوییو عەبباسیی و عوسمانیی، خۆیان ئەو ناوەیان نەبووە، هەر دەوڵەت بوون و تەواو.

بۆیە پێم وایە بەكارهێنانی ئەو وشەی (ئیسلامیی)یە، كاتی خۆی هەل و مەرج و واقیعێك بۆی ناچاری كردووین و، زیاتر

www.alibapir.net

وەك كاردانەوەيــەك بــووە و، ناحەقيشــمان نــەبووە و ناشــڵێم شتێكی خراپمان كردوە، بەڵام ئەوە بۆ قۆنـاغی خـۆی و ئێسـتاش قۆنـاغێكی دیكەيـە، بـۆ زيـاتر ڕوونبوونـەوەی مەبەسـت دەڵـێم: كـاتی خـۆی چـەكمان پـێ بـوو، قۆناغەكـەمان وای دەخواسـت: خــەڵكو وڵاتمــان داگيركرابــوو، ســتەمی زۆرو جــۆراو جۆرمــان لێــدەكرا، بــەڵام كاتێــك قۆناغەكــە بەسەرچــوو، چــەكمان دانــا، چەكمان داناو چەكدار نينو، ئێستا خەباتی چەكداريی ناكەينو، ئێستا جەنگاوەر (مقاتل) نين، بەڵام هەر تێكۆشەر (مجاهد)ينو جيهـاد بەردەوامـە، تێكۆشـانو خـەبات هـەر بەردەوامـە، بـەڵام شێوەكەی لەكاتێكەوە بۆ كاتێك دەگۆڕێ.

مەبەستم ئەوەيە: پێويستە هەر شتێك بـزانين ڕێمـان لێ دەگـرێ كە ئەو پەيامەی خوا، ئەو ئيمانو ئيسلامە، ئـەو ئامـانجو بـەها بەرزانە، ئەو ئاكارو ڕەوشتە پەسـندانەی ئـايينی خـوا گرتوونيـە خۆی، زيـاتر بەرينـە نێـو خـەڵكو، كارلێكيـان لەگـەڵ بكـەن، بـا لايبــەرين و بەشــێوەيەكی لێ بكــەين: زيــاتر دەرفــەتی بــۆ بكەينەوەو فراوانی بكەين.

ameer.maktab@yahoo.com

 /AliBapir  /AliBapir  /MediaAmeerOffice

www.alibapir.net

www.alibapir.net

**سەرنجی شەشەم:** وشەی (ئیسلامی سیاسیی) ناتۆرەیە:

وشەی (ئیسلامی سیاسیی) ناوو ناتۆرەیەکە بەکاردەهێندریّ، لەلایەن هەمووو ئەوانەوە، کە دەیانەوێ واقیع وەك خۆی بمێنێتەوە، چ ڕژێمە میراتییو بنەماڵەییەکان، وەك ئەوانەی کەنداو، چ وڵاتانی ڕۆژئاوا و پاشکۆیەکانی، کە بەئیسلام قەڵسن، چونکە تاکە شتێك بتوانێ ببێتە بەدیلو ئەڵتەرناتیڤی فەلسەفەکانی ڕۆژئاوا، بریتییە لە ئیسلام، ئنجا چونکە زیندوویەتیی ئەهلی ئیسلامیش لەو جموجۆڵە ئیسلامییانە دایە، زیندووییەتی ئەهلی ئیسلامو ئۆممەتی پێغەمبەر ﷺ لەو خەڵکە دایە کە دەڵێن: دەبێ بگەڕێینەوە بۆ ئیسلامو، بانگەواز بۆلای خوا دەکەنو، فەرمان بە پەسند دەکەنو، ڕێگریی لە ناپەسند دەکەنو، خەبات دەکەن، زیندوویەتییەکەی ئۆممەت لەوانە دایە، ئەگەرنا ئەوەی دیکە کوا؟! بۆ وێنە: تەماشای خەڵکی مسوڵمانی هەرێمی کوردستان بکە! کە هەمووی خۆیشی بە مسوڵمان دەزانێ، کوا بوونت؟ کوا بەرگریی کردنت لە قورئانو لەڕێبازی پێغەمبەر ﷺ، لەئیمانو عەقیدەی ئیسلامیی، لە شەریعەت ، کوا لەکوێ یە؟

بەڵێ ئەوە ناوو ناتۆرەیە بەکاردەهێندرێ، ئەگەرنا ئیسلام یەك ئیسلامە, ئیسلام هاتوە: کاروباری خەڵك بەڕێوە بەرێ، کە ئەوە

www.alibapir.net

سیاسەتی پێ دەڵێن، هاتوە لەڕووی ئابوورییەوە دادگەریی بچەسپێنێ، لەڕووی کۆمەڵایەتییەوە، یەکسانیی بچەسپێنێ، ئەگەرنا ئیسلام یەك ئیسلامە، نەك ئیسلامی سیاسییو، ئیسلامی ئابووریيو، ئیسلامی فیکرییو، ئیسلامی سۆفییو، ئیسلامی سەلەفیی، لەڕاستییدا ئەوانە هەموویان ناوو ناتۆرەن، ئیسلام یەك ئیسلامە، خوای پەروەردگار کە دەفەرموێ: ﴿وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلۡإِسۡلَٰمَ دِينٗاۚ﴾ (المائدة: ٣ )، واتە: ئیسلامم بە بەرنامە بۆ پەسند کردوون، خوا (عزوجل) بە گشتی وا دەفەرموێو، ئەو ئیسلامە کە یەك ئیسلامە، هەموو ئەو لایەنو ڕەهەندانەی تێدان، مەبەستێکی دیکەشم لەوەدا هەبوو، دوایی باسی دەکەم.

ameer.maktab@yahoo.com
/AliBapir /AliBapir /MediaAmeerOffice
www.alibapir.net

**سەرنجی حەوتەم:** کێشەو گرفتی مسوڵمانان لەگەڵ دیکتاتۆرییو ستەمو سەپاندن دایە، نەك لەگەڵ دیموکڕاسیی دا

کێشەو گرفتی مسوڵمانان لەم ڕۆژگارەدا، لەگەڵ ڕژێمە ستەمکارو دیکتاتۆرەکاندایە، نەك لەگەڵ دیموکڕاسیی دا، هەرگیز بیستووتانە ستایشی دیموکڕاسیی بکەم؟ مەدحی ناکەم، بەڵام دەڵێم: چاکی نێو خراپانەو، باشترین شتێکە کە فیکری

www.alibapir.net

بەشەر پێی گەیشتوە بۆ حوكمڕانیی، لەوە زیاترم نەگوتوە، بەڵام تەماشا بكەن! لەهەر شوێنێك تۆزێك دیموكڕاسیی بووبێ، ئیسلامییەكان بردوویانەتەوە، لە هەموو دنیا دا، لە هەر شوێنێك هەڵبژاردنێك بووبێ، لەگەڵ ئەو دیموكڕاسییەدا تۆزێ ڕاستیان كردبێ، ئیسلامییەكان قازانجیان كردوەو، دەنگی براوە و سەرەوە بوون.

كێشەی ئێمە لەگەڵ ستەمكاریی‌و سەپاندن (إستبداد)و دیكتاتۆریی دایە، لێتان تێك نەچێ! ئایا كێ زۆر ڕەواج بەوە دەدا كە دیموكڕاسیی كوفرەو كوفرە؟ ئەو ڕژێمە میراتیی‌و بنەماڵەییانەن، كە ئەگەر بناغەی حوكمڕانیی: ﴿ وَأَمۡرُهُمۡ شُورَىٰ بَيۡنَهُمۡ ﴾ (الشورى: ٣٨) بێ، كەبەدڵنیایی: ﴿ وَأَمۡرُهُمۡ شُورَىٰ بَيۡنَهُمۡ ﴾ی ئێمە، زۆر لە دیموكڕاسییەكەی ڕۆژئاوا باشترە، ئەگەر ئەوە بێ، ئەوان: (أمرهم شوربة بينهم)یان لێ تێك دەچێ، عیبادو بیلاد چی دیكە نابێتە موڵكی شەخسیی خۆیان‌و بنەماڵەكەیان‌و بە میراتی بگرن، وەك ئەحمەد عەرابی پادشا، كاتی خۆی لە خدێوی میسر ڕادەپەڕێ، دەڵێ: (إن الله تعالى خلقنا أحراراً ولم يخلقنا عَقاراً، والله لا نُورَّث بعد اليوم)، واتە: خوا ئێمەی بە ئازاد خوڵقاندوەو، موڵك‌و ماڵ نین، بە خوا لەمەودوا نابێ بە میرات بگیرێین.

www.alibapir.net

دەبێ وریا بین! ئەو نەغمەو زەمزەمەیە، کە لە دەوڵەتانی کەنداو و هەندێك لە وڵاتانی دیکەی مسوڵماننشینەوە دێ، کە ئێستا بەزەقیی ئیعلانی دژایەتیی تەوژمی ئیسلامیان کردوە، گوایە: ئیسلام دژی دیموکراسیە! ئەوە لە دڵسۆزییەوە نیە بۆ ئیسلام، بەڵکو ترسی کورسیی و حوکمە میراتییەکەی خۆیانیان هەیەو، وەك گوتراوە: ئەو شینە بۆ حوسەین نیە و بۆ هەریسەکەیە!

بێگومان ئێمە بەدیلمان هەیە بۆ دیموکراسیی کە ڕاوێژ (شوری)ە، بەلام بەداخەوە، حوکمڕانە خۆسەپێنە میراتییو بنەماڵەییەکانی ئومەوییو عەبباسییو عوسمانییو، ئەوانەی دوای ئەوانیش، نەیانهێشتوە ڕاوێژ (شوری) گەشە بکاتو، زیاتر وەك بەهایەکی ئەخلاقیی بەرز ماوەتەوە، بەڵێ ئێمە کێشەیەکمان لەگەڵ دیموکراسییدا هەیە، ئەویش ئەوەیە کە پەرژینێکی نیە بۆ ئیرادەی خەڵك، کە لە سنوور دەرنەچێو، بەدوای ئارەزوو نەکەوێو، یاسایەك دەرنەکات پێچەوانەی شەریعەت بێ، ئەو کێشەیەمان لەگەڵ دیموکراسیی دا هەیە. بەلام سەدو یەك (١٠١) کێشەمان لەگەڵ ستەمو دیکتاتۆریی دا هەیە، تەماشای قورئان بکەن، دوو نموونەتان بۆ دێنمەوە:

www.alibapir.net

**أ- نموونەی یەکەم: حوکمی خۆسەپاندن (إستبدادي):**

فیرعەون دەڵێ: ﴿مَآ أُرِيكُمۡ إِلَّا مَآ أَرَىٰ وَمَآ أَهۡدِيكُمۡ إِلَّا سَبِيلَ ٱلرَّشَادِ﴾ (الغافر: ٢٩)، واتە: هەرئەوەتان پێ دەڵێم کە بۆخۆم، پێم باشەو، هەرچی دەشیڵێم، هەمووی ڕاستە!

ئا ئەوە لۆژیکی دیکتاتۆرییە، ئنجا سەرنج بدەن! قورئان چەندە زەمی فیرعەونی کردوە! چونکە سەرەنجامی لۆژیکی دیکتاتۆریی فیرعەون ئاوایە: ﴿وَقَالَ فِرۡعَوۡنُ ذَرُونِيٓ أَقۡتُلۡ مُوسَىٰ وَلۡيَدۡعُ رَبَّهُۥٓ﴾ (الغافر: ٢٦) ، واتە: فیرعەون گوتی: لێم گەڕێن با موسا بکوژمو، ئەویش لە پەروەردگاری بپاڕێتەوە! واتە: لەخوا بێ منەتم، بەڵام ئایا فیرعەون پاساوو بیانووی چییە کە مووسا (علیە السلام) بکوژێ؟! ﴿إِنِّيٓ أَخَافُ أَن يُبَدِّلَ دِينَكُمۡ أَوۡ أَن يُظۡهِرَ فِي ٱلۡأَرۡضِ ٱلۡفَسَادَ﴾ ، واتە: من دەترسم دینەکەتان بگۆڕێ، یاخود ژینتان تێك بدات!

ئاشکرایە دینەکەیان فیرعەون پەرستیی بوو، ژینەکەشیان کۆیلایەتیی بوو!

لێم گەڕێن با مووسا بکوژم! ئەوە لۆژیکی دیکتاتۆرییە.

www.alibapir.net

**ب- نموونەی دووەم، حوکمی ڕاوێژکردن بە خەڵك:**

تەماشابکەن! خوا مەدحی ئافرەتێك دەکا (شاژنی سەبەء)، ئایا ئەو ژنە حوکمڕانە چی گوتوە؟:

﴿ قَالَتْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمَلَؤُا۟ إِنِّىٓ أُلْقِىَ إِلَىَّ كِتَٰبٌ كَرِيمٌ ﴿٢٩﴾ إِنَّهُۥ مِن سُلَيْمَٰنَ وَإِنَّهُۥ بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴿٣٠﴾ أَلَّا تَعْلُوا۟ عَلَىَّ وَأْتُونِى مُسْلِمِينَ ﴿٣١﴾ ﴾ النمل: ٢٩ - ٣١، واتە: (شاژنی سەبەء ) گوتی: ئەی بڕیار بەدەستان! من نامەیەکی بەڕێزم بۆ نێرراوە (کە ئەوە دەقەکەیەتی:) ئەمە لە سولەیمانەوەیەو، بەناوی خوای بەبەزەیی بەخشندە، خۆتان لە بەرانبەرم دا بە بەرز مەگرنو بەتەبایی (ملکەچیی) وەرن بۆلام (بۆ وتووێژ)، دوایی دەڵێ: ﴿ قَالَتْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمَلَؤُا۟ أَفْتُونِى فِىٓ أَمْرِى مَا كُنتُ قَاطِعَةً أَمْرًا حَتَّىٰ تَشْهَدُونِ ﴿٣٢﴾ ﴾ (النمل: ٣٢)، گوتی: ئەی قسەڕۆیشتووان! ڕای خۆتانم پێ بڵێن، چونکە من هیچ بڕیارێك نادەم، تاکو ئێوەش ئامادە نەبن.

ئنجا ئا ئەوە نێوەڕۆکی دیموکڕاسییە: کە حوکمو دەستەڵات هی خەڵك بێ، بڕیار بەدەست خەڵکەوە بێو، کەسێك لەسەریان فەرز نەکاتو، بڕیار کە دەدرێ، بە پرسو ڕای خەڵك بێ، ئەوەتا خوای پەروەردگار مەدحی ئەو ئافرەتە دەکاتو، سەرەنجامی ئەو

www.alibapir.net

ئافرەتەش باس دەكا، كە دوایی دەڵێ: ﴿وَأَسْلَمْتُ مَعَ سُلَيْمَٰنَ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾ (النمل: ٤٤)، لەگەڵ سولەیمان دا بۆ خوای پەروەردگاری جیهانییان ملكەچم.

هەروەها چارەنووسی فیرعەونیش باس دەكا: ﴿فَأَخَذْنَٰهُ وَجُنُودَهُۥ فَنَبَذْنَٰهُمْ فِى ٱلْيَمِّ وَهُوَ مُلِيمٌ ﴿٤٠﴾﴾ (الذاريات: ٤٠)، واتە: خۆیو سەربازەكانیمان گرتو، بەسەرزەنشتكراویی فڕێماندانە دەریاوە.

مەبەستم ئەوەیە دەبێ وریا بینو، نەكەوینە ژێر كاریگەریی هەندێك فەتواو قسەوقاڵی هەندێ بازرگانییكار بە ئایینەوە (متاجر بالدين) كە ئاو بە ئاشی ئەو ڕژێمە میراتییو بنەماڵەیی، یان عەسكەرتارو خۆسەپێنانەدا دەكەن، كە دەزانن: هەر تۆزێك دیموكڕاسیی هەبێ، حوكمە بنەماڵەییەكەیان، یان حوكمە عەسكەرتارییەتەكەیان لێ تێك دەچێ، یەك تۆز دیموكڕاسیی ڕاستەقینە هەبێ، ئەوان لێیان تێك دەچێ، بۆیە دژی دیموكڕاسیین، ئەگەرنا لەبەر ئەوە نیە، كە فلان شتی ناشەرعیی تێدایە! ئایا دیكتاتۆریی كەمی ناشەرعیی تێدایە؟! دیكتاتۆریی هەر ڕێك لەگەڵ تەوحیددا تێك دەگیرێ، كە دەڵێ: خەڵك بەندەی خوایەو، نابێ كۆیلەی حیزبو ڕژێمو كەسو بنەماڵە بێ!

www.alibapir.net

**سەرنجی هەشتەم: خۆناسینو واقیع ناسین:**

بەڵێ دەبێ خۆمان چاك بناسینو، واقیعەكەی خۆشمان باش بناسین، چونكە زۆر موسیبەت و بەڵای گەورە، كە بەسەر ئیسلامییەكان هاتوون، لەبەر خۆ نەناسینو واقیع نەناسین بووە.

یەكێك لە هەڵەكانی كۆمەڵی ئیسلامیی پاكستان، ئەوە بووە كە كاتی خۆی: ئەبولئەعلای مەودوودیی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ)، پیاوێكی گەورەو چاك بووە، بەڵام ئیسلامی زیاتر لەلایەنی سیاسیی دا خولاسە كردوە، (سید قطب) یش (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) كە ئەویش پیاوێكی بلیمەتو گەورە بووەو، خۆی فیدای ئیسلام كردوە، ئەویش زۆر كارتێكراو بووە بەو بیرۆكەیەی وی و، ئەو ئیسلامە گەورەو پانو پۆڕەیان، زیاتر لەكاری سیاسیی دا كورت كردۆتەوەو، لەو ڕووەوە تووشی زێدەڕۆیی (إفراط) بوون.

یەكێكی دیكە لە هەڵەكانیان، (كۆمەڵی ئیسلامیی پاكستان) ئەوە بووە كە زۆر پشتیان بەستوە بە بژاردە (نخبة)و، نەیانهێشتوە كۆمەڵەكەیان ببێتە بزووتنەوەیەكی جەماوەریی، كە ئێستا بەم دوا دواییانە، بە هەڵەی خۆیانیان زانیوە.

ameer.maktab@yahoo.com
/AliBapir /AliBapir /MediaAmeerOffice
www.alibapir.net

www.alibapir.net

کۆمەڵی ئیسلامیی پاکستان چەند ساڵە هەیە، بۆیە هەر بچووک بووە، چونکە هەر هی بژاردە بووەو، خەڵک باش پێی نەزانیوەو، لەگەڵیدا ئاوێتەو هاوئاواز نەبووە.

مەبەستم ئەوەیە کە: ئەگەر هەرکام لە (أبو الأعلى المودودي) و (سید قطب) خوا لێیان خۆشبێ، توانـاو بڕستی خەڵکەکەی خۆیانو، واقیعی کۆمەڵگایەکانی خۆیانیان، باش زانیباو ناسیبا، لەجیاتی ئەو هەموو جەختکرنەوەیان لەسەر حوکمو سیاسەتو پێکهێنانی دەوڵەتی ئیسلامیی، زیاتر کاریان لەسەر هۆشیاریی‌و بێداریی خەڵکو جەماوەرو، تێگەیاندنو پێگەیاندنیان دەکرد، چونکە:

١- ئەوە کاکڵو جەوهەری کاری ئیسلامییە.

٢- بەبێ خەڵکو کۆمەڵگایەکی تێگەیشتوو پێگەیشتووش لە ئیسلام دا، واقیعی ئیداریی‌و سیاسیی‌و ئابووریی ناگونجێ بگۆڕێ.

ئەوەی پێویستە بزانرێ ئەوەیە کە ئەم کارو پڕۆژە ئیسلامییە، تاکو نەچێتە نێو خەڵک، خەڵک قەناعەتی پێ نەهێنێو لە باوەشی نەگرێو پشتگیریی نەکات، ناتوانین تەمکینی بۆ بکەین، پێغەمبەران (صەڵاتو سەلامی خوایان لەسەر بێ) هەموویان

www.alibapir.net

ڕەوایەتیی ئاسمانییان هەبووە، بەڵام تاکو ڕەوایەتیی زەوییـان بـۆ پەیدا نەبووە، واتە تاکو ڕەوایـەتیی خـەڵکیان بـۆ پەیـدا نـەبووە، نەیانتوانیوە ئەمرو نەهی بکەن‌و، واقیعـە سیاسـیی‌و ئـابووریی‌و کۆمەڵایەتییەکە بگۆڕن.

با تەماشای ئەم دوو ئایەتە موبارەکە بکەین لە سووڕەتی (الانفال):

یەکەمیان ئایەتی (٦٥)، خوا دەفەرموێ: ﴿إِن يَكُن مِّنكُمْ عِشْرُونَ صَـٰبِرُونَ يَغْلِبُوا۟ مِا۟ئَتَيْنِ ۚ وَإِن يَكُن مِّنكُم مِّا۟ئَةٌ يَغْلِبُوٓا۟ أَلْفًا مِّنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَّا يَفْقَهُونَ﴾ ، واتە: ئەگەر ئێوە بیست کەسی خۆڕاگرتان هەبن، بەسەر دووسەدو، ئەگەر سەدتان هەبێ، بەسەر هەزار کەس لە بێبڕوایان دا زاڵ دەبن، ئەویش بەهۆی ئەوەوە کە ئەوانە کۆمەڵێکن نافامن.

کەواتە: دوو مەرج هەن بۆ زاڵبوونی مسوڵمانان:

یەکەم: چەندێتیی: ﴿إِن يَكُن مِّنكُمْ عِشْرُونَ﴾.

دووەم: چۆنیەتیی: ﴿صَـٰبِرُونَ﴾.

www.alibapir.net

واتە: تەنیا چەندێتیی و ژمارە بەس نیەو، دەبێ چۆنیەتییش هەبێ و وێڕای قەبارە، باشییش هەبێ، دوایی دەفەرموێ ﴿بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَّا يَفْقَهُونَ﴾، ئەوانیش (کافرەکان) لەبەر ئەوەی چۆنیەتییەکەیان، تەواو نیەو وردتێگەیشتن (فقە)یان نیە، ورد تێنەگەیشتوون، خۆیان‌و خوایان نەناسیوە، بۆیە لەبەرامبەر ئێوەدا تێکدەشکێن، ئێوە یەك بە دە (١ - ١٠)ن.

دوایی خوای پەروەردگار بۆیان دەکا بە یەك بە دوو (١ - ٢)، چونکە دەفەرموێ: ﴿ ٱلْـَٔـٰنَ خَفَّفَ ٱللَّهُ عَنكُمْ وَعَلِمَ أَنَّ فِيكُمْ ضَعْفًا ﴾ (الأنفال: ٦٦) ، یانی، چونکە جۆرەکەیان دابەزی، دەبێ لەمەودوا ژمارەکەی زیاد بکەن، دەبێ لەبەرامبەر دووسەد (٢٠٠)دا، سەد (١٠٠) کەس هەبن، پێشێ لەبەرامبەر دووسەد (٢٠٠)دا، بیست (٢٠) کەس بەس بوو و، لەبەرامبەر: هەزار (١٠٠٠)دا، سەد (١٠٠) کەس بەس بوو!

کەواتە: دەبێ بزانی، تۆ چ جۆرێکی؟ دەبێ خۆت بناسی: لەڕووی ژمارەوەو، لەڕووی جۆرو، لەڕووی کەرەستەوە، لە (ژیاننامەی پێغەمبەر)دا هاتوە، پێغەمبەر ﷺ کە دەچێتە مەدینە دەفەرموێ: مسوڵمانانم بۆ سەرژمێر بکەن، (أكتبوا لي مَنْ تلفّظ

www.alibapir.net

بالإسلام، من الناس) بۆی سەرژمێر دەکەن‌و ژمارەیان هەزار و پێنجسەد (١٥٠٠) کەس دەبێ.[١]

لە میسرِ، مسوڵمانانی میسرِ، ئێستاشی لەگەڵدا بێ، چییان پێ دەکرێ! بۆچی وایان لێ هات؟! بێگومان نەخشەو پیلانی ئەهلی کوفر و نیفاقی جیهانیی‌و ناوچەیی هەبوو، بەلام خۆشیان کۆمەڵێك هەڵەیان هەبوون:

١- یەکێك لە هەڵەکانیان خۆ نەناسین بوو، لە حاڵێك دا تۆ نە هێزی سەربازییت هەبێ، نە هێزی ئاسایشت هەبێ، نە هێزی ڕاگەیاندنت هەبێ، نە هێزی پەیوەندییەکانت هەبێ، نە هێزی ئابوورییت هەبێ، کەچی بشتەوێ حوکمی میسرِ بکەی، بەهەموو شتێکیەوە!

٢- ئنجا سەرەتا گوتیان: کاندیدمان نابێ بۆ سەرۆك کۆمار، دوایی کاندیدیشیان هەبوو! خەڵك لێیان بێ متمانە بوو و، خەڵك لێیان ترسا.

٣- لە ڕاستییدا وشکە سەلەفییەکانیش کە ئێستا لەباوەشی (سیسی)دان، ئەوانیش زۆر حیساباتیان لێ تێك دان، ئنجا ئەوەی من بۆم دەرکەوتوە، ئەوەیە کە بەشێك لەو سەلەفییانە، لە

---

[١] الوثائق السياسية للعهد النبوي و الخلافة الراشدة ، محمد حميد الله، ص ٦٥.

www.alibapir.net

هـەركام لـە تـەوژمی ئیسـلامیی: یەمـەن‌و سـوودان‌و تـونس میصرپیش حیساباتیان تێك داوە، کە بەلای توندیی و سەختیی‌و وشـکیی دا دەچـن‌و، کۆمەڵگاکـەش بەرگـەی ئـەوە نـاگرێ‌و، سەرەنجام خەڵکەکە لـە هـەموو کـارە ئیسلامییەکەو، لـە هـەموو پرۆژەکـە هەڵدەگەڕێنـەوەو، بێگومـان دەزگـا سـیخوڕییەکان‌و ڕاگەیاندنی چەواشەکارانەی ناحەزانیش، ڕۆڵی خۆیان دەگێڕن.

بەڵێ: دەبێ تۆ خۆت بناسی، واقیعەکەت بناسی، بزانـی داخـۆ لـە چ دنیایەك‌و، لە چ واقیعێك دای، هێزە نێودەوڵەتییـەکان بناسـی، ئـەمریکا هەڵوێسـتی چییە؟ جوولەکـە چـی دەڵـێ؟ ڕژێمـەکانی ناوچـەکە چـی دەڵـێن؟ ڕۆژنامەنووسـێکی میصـرپیی بـرادەرم دەیگوت: ئەوەی کە هەر بە ئاشکرا گوتوویانە: (سعوودیە) بیست (٢٠) ملیار دۆلاری بۆ (سیسي) ناردوە، بۆ ئەوەی لەوێ: ﴿ وَأَمۡرُهُمۡ شُورَىٰ بَيۡنَهُمۡ ﴾ (الشـوری: ٣٨)، نەچەسـپێ‌و، کیـانێکی ئیسـلامیی ڕەسەن‌و ڕێك‌و پێك پەیدا نەبێ، تاکو دوایـی خـەڵك بڵـێ: ئـەدی سـعوودیە تـۆش بۆچـی وای لێ ناکـەی، بۆچـی عیبـادو بـیلاد هەمووی موڵکی ماڵێك بن؟!

ameer.maktab@yahoo.com

 /AliBapir  /AliBapir  /MediaAmeerOffice

www.alibapir.net

www.alibapir.net

**سەرنجی نۆیەم:** خۆپاراستن لە کاروکاردانەوەی کورتهێنەرانەو تێپەڕێنەرانە

بەڵێ دەبێ وریا بین‌و، خۆبپارێزین لە هەندێك کارو کاردانەوەی سەیر: بۆ نموونە:

١) تەنیا کاری سیاسی بکەین، یاخود: نەخێر با دووربین لەکاری سیاسیی!

چونکە ئەوە ئێستا هەمووی هەیە لەنێو مسوڵمانانداا، هەندێك دەڵێن سیاسەت فرت‌و فێڵەو بقەیەو، هەندێکی دیکەش دەڵێن: با تەنیا کاری سیاسیی بکەین، کە بێگومان هەردووکیان هەڵەن‌و ئێمە: دەڵێین نە تەنیا کاری سیاسیی، نە دوور لە کاری سیاسیی.

٢) هەندێکیان ئەوەندە تێدەپەڕێنن لەبواری بەکارهێنانی هێز و چەك دا، تاکو سەری لەڕێکخراوو گرووپی وەك قاعیدەو داعش، دەردەچێ، هەندێکیش لەکاردانەوەدا، هەستیارییان بەرامبەر بە ئایەتەکانی جەنگ‌و جیهاد هەیەو، جەنگ‌و جیهاد ئەگەر پێویستیش بێ، هەر نایکەین، کە هەردووکیان هەڵەن.

٣) هەندێك سەلەفیی هەستیارییان هەیە بەرامبەر بە ئەهلی تەصەووف‌و، بەشێك لە ئەهلی تەصەووفیش بەوان قەڵسن، لەحاڵێکدا کە سەلەفی صاڵحی ئێمە، هەموویان ئەهلی (صفاء)

www.alibapir.net

بوون، ئەهلی تەصەووفی ڕاستەقینەش، شوێنکەوتووی سەلەفی صالح بوون، وەك لە كتێبەكانی خۆمدا باسم كردوە.

٤) یان حیزبیی بوون، یان دژی حیزب بوون! واتە: یان كورت هەڵێنانی مسوڵمانەتیی‌و دینداریی لە حیزبیی بوون دا، یان حیزبایەتیی لە دەرەوەی بازنەی ئیسلام دانان!! كە بێگومان هەردووكیان هەڵەن، بەڵێ بێگومان ئۆممەت هەمووی لە حیزب دا جێی نابێتەوە، بەڵام بوونی حیزب‌و خەڵكێكی سیستماتیك‌و ڕێك‌و پێك، كە كاری خۆیان بە بەرنامە ڕێكدەخەن، ئەوە یەكێكە لە پێویستییەكانی كۆمەڵگاكانی ئەم سەردەمەی ئێمە.

ئنجا ئەگەر تۆ واز لە ناوەكە بێنیی‌و، بێیە سەر نێوەڕۆكەكە: ئەدی ئەوە نیە سەلەفییەكانیش لێك كۆبوونەوەو، صۆفییەكانیش لەیەك كۆبوونەوە، ئایا ئەوەش هەر حیزبایەتیی نیە؟ ئەوی دیكە بەناوی (نوور)و، ئەوی دیكە بەناوێكی دیكەو، ئەوی دیكە بەناوی ڕێكخراوی مەدەنیی، هەر وانیە؟! لە ڕاستییدا هەمووی هەر بەرنامەی هەیەو، كۆدەبێتەوەو، بودجەی هەیەو، ئەمرو نەهیی هەیە، هەمووی هەر ڕێك و پێكی (سیستم) هەیەو، حیزبیش هەر ئەوەیە.

ameer.maktab@yahoo.com

 /AliBapir  /AliBapir  /MediaAmeerOffice

www.alibapir.net

www.alibapir.net

٥) هەروەها لەڕووی فیکرییەوە: دەبێ ئاگامان لە فیکری (إرجائي) بێ، هەروەك ئاگامان لە فیکری (خوارج)یش بێ. فیکری (إرجائي) کە هەر ئیماندار، هەر دادەڕووتێنێ، لە هەموو کردەوەیەك، دەڵێ: مسوڵمان هیچ کردەوەی چاکی نەبێ، ئیمانی تەواوی هەر هەیە! فیکری (خوارج)یش دەڵێ: مرۆ هەر تۆزێك خۆی بجوولێنێ، کافر بووەو، بە کردنی گوناهێك کافر دەبێو، لە بازنەی ئیسلام دەچێتە دەر! کە بێگومان هەردووکیان هەڵەن و، یەکەمیان بەزایەدان (تفریط)، دووەمیان تێپەڕاندن (إفراط)ە.

٦) هەروەها بە باری دیکەدا: لەڕووی بیری (ناصبة)و (رافضة)وە، دوو گرووپ هەبوون (ناصبة) کە دژایەتیی بنەماڵەی پێغەمبەریان ﷺ کردوە، بە بیانووی خۆشویستنی هاوەڵانەوە، ئەوانە (ناصبة) بوونو، کاتی خۆی لە یەمەنو شام هەبوون، لە ئومەوییەکان، ناڵێم هەموویان بەڵکو هەندێکیان.

لە بەرانبەریشیان دا (رافضة) هەبوون ون دژایەتیی هاوەڵانیان کردوە، بە بیانووی بەرگرییکردنەوە، لە بنەماڵەو خزمانی پێغەمبەر ﷺ، کە هەردووکیشیان هەڵە بوون، چونکە تۆ ئەگەر پێغەمبەری خوات ﷺ خۆش بوێ، دەبێ هەم خزمەکانیت خۆش بوێنو، هەم هاوەڵانیشی، هاوەڵەکانی (خوا لێیان ڕازی بێ) ئەوانە بوون کە ئیسلامیان بۆ ئێمەهێناو بەرجەستە کردو،

www.alibapir.net

خزمەكانیشی ئەوانەی كە لەسەر ڕێ‌و شوێنی ئەو بوون، ئەوانیش هەر لە نێو هاوەڵاندان، ئەوانەی كە لەسەردەمی پێغەمبەردا ﷺ بوون.

**سەرنجی دەیەم: سێ پەرچ‌و لەمپەری ڕێی كاری ئیسلامیی:**

پێم وایە سێ كۆسپ‌و لەمپەر هەن، لەبەردەم گەشەكردن‌و بەرەو پێش چوونی كاری ئیسلامیی دا، كە ناچارم زۆر بە كورتیی و گوشراویی باسیان بكەم، ئەگەرنا، ئەگەر بویسترێ مافی خۆیان پێ بدرێ، دەبێ چەندان وتاریان لەسەر بدرێن، نەك چەند قسەیەكی كورت، كە زیاتر ناوونیشانی ئەو سێ كۆسپ‌و لەمپەرە دەخەنەڕوو:

**یەكەم: كرچ‌و كاڵیی خۆمان:**

هەمووتان دەزانن كە چێشت هەتا نەكوڵێ، ناخورێ‌و، میوە هەتا نەگات، بەكرچ‌و كاڵیی بەكەس ناخورێ‌و، ئەگەر بشخورێ كەڵك ناگرێ!

بە تێگەیشتنی منیش ئێمەی ئیسلامیی، هەم لێرە – لە هەرێم‌و عێراق دا – و هەم لەزۆربەی وڵاتانی دیكەش دا، لەچاو

www.alibapir.net

بەرزیی‌و تێرو تەواویی ئیسلامی بەرجەستە لە قورئان‌و ڕێبازی پێغەمبەری خوادا ﷺ، کرچو کاڵیی‌و ناتەواویی زۆرمان هەیە، لە هەموو ڕوویێکەوە:

١) فیکریی‌و ئیمانیی.

٢) عیبادەت‌و تەقواو تەزکیە.

٣) ڕەوشت‌و ئاکارو هەڵس‌و کەوت.

٤) هۆشیاریی سیاسیی.

٥) ڕۆشبنیریی.

٦) بەکارهێنانی شێوازو ئامرازی تازەو هاوچەرخانە.

٧) پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان.

بۆیە ئەگەر بمانەوێ ئەم کۆسپو لەمپەرە، لەبەردەم گەشەکردن‌و فراوانبوونی کارو پرۆژەی ئیسلامیی دا لابەرین – کە گەورەترین کۆسپو پەرچە- دەبێ لە هەموو ئەو حەوت بوارە گرنگ‌و سەرەکییەدا، کە ئاماژەمان پێکردن، هەوڵی خۆ پێگەیاندنی زیاترو چاکتر بدەین.

www.alibapir.net

بەڵێ بەڕێزان! ئەگەر بمانەوێ باشتر ئەركی سەرشانمان بەرانبەر بە كۆمەڵگاكەمان جێ بەجێ بكەین‌و، زیاتر جێی ئومێدی خێرو متمانەو باوەڕیان بین‌و، چاكتر پەیامی پڕ خێرو بەرەكەتی ئیسلاممان لێوەربگرن، دەبێ هەوڵبدەین لە هەموو ڕوویێكەوە، تێگەشتوو و پێگەیشتوو بین‌و، بچینە ئاستی بەرزی ئایین‌و بەرنامەی تێرو تەواوی خواوە، ئەگەرنا ئەگەر تەنیا قسەو وتارمان لە خەڵك زیاد بێ، با بەتەما نەبین لە ئاستی بەرپرسیارێتیی دا، ئەركی خۆمانمان بۆ ئەنجام بدرێ.

كەواتە، با هەرچی زیاتر:

١- خوێندەوارو شارەزاو بەرچاو ڕوون بین، لە هەموو بوارەكانی دین‌و ژین دا.

٢- ئیمان‌و عەقیدەمان، پتەوترو بەهێزترو قووڵتر بكەین.

٣- خواپەرستیی و پارێزكاریی‌و تەزكیەی نەفسمان، باشتر بكەین‌و پەیوەندییمان لەگەڵ خوادا، گەرم‌و گوڕتر و بەتینتر بێ.

٤- ڕەوشت‌و ئاكارو هەڵس‌و كەوتمان، پەسندترو بەرزو جوانتر بێ.

ameer.maktab@yahoo.com

 /AliBapir  /AliBapir  /MediaAmeerOffice

www.alibapir.net

www.alibapir.net

٥- هۆشیاریی سیاسییمان، لەسەر ئاستی نێوخۆو دەرەوەو ناوچەیی‌و جیهانیی پتربێ.

٦- ڕۆشنبیرییمان، فراوانترو گشتگیرترو هەمەجۆرتر بێ.

٧- شێوازو ئامرازەکانمان پسپۆڕانەترو هاوچەرخانەتر بن.

٨- پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانمان کراوانەترو توندوتۆڵترو دڵسۆزانەتر بن.

ئەگەر دەمانەوێ گەورەترین کۆسپو لەمپەری سەرڕێی کاری ئیسلامیی لابدەین!

ameer.maktab@yahoo.com
/AliBapir

/AliBapir

/MediaAmeerOffice
www.alibapir.net

**دووەم: دواکەوتوویی کۆمەڵگا:**

بەڵام هەمووشی هەر خەتای خۆمان نیە، مرۆڤ هەرکات کە حوکم دەکات، دەبێ تەماشای هەموو لایەنەکان بکات، کۆمەڵگاکەمان بە گشتی دواکەوتووە، ئەگەر دواکەوتوو نەبێ، - لەم هەرێمی کوردستانەدا - دوو حیزب لەماوەی بیست‌و حەوت (٢٧) ساڵی ڕابردوودا، خەڵك ئەو هەموو گەندەڵیی‌و قۆرخکاریی‌و ستەم‌و قڕیی‌و پڕیی‌و چینایەتییەیان لێ بینین، دەبێ ئەو هەموو دەنگە بێنن! دیارە کۆمەڵگایەکە دواکەوتووە،

www.alibapir.net

بـەڵێ دەزانـین تـەزویریش کـراوە، بـەڵام هـەر دەنـگ نـەدانی خـەڵكو، نەچوونی خـەڵك بـۆ دەنگـدان، کـە بـوار دەکاتـەوە بـۆ تـەزویر، ئـەوەش هـەر دواکەوتوویـیـەو، هەسـت نەکردنـە بـە بەرپرسـیاریەتیی! بـەڵێ کۆمـەڵگاش دواکـەوتووەو. دەبـێ کـار بکەین لەسەر بەرەو پێشبردنو گەشەپێدانی زیاتری کۆمـەڵگا بـە گشتی.

هەڵبەتە کۆمەڵگا بەگشتی لەزۆر ڕووەوە دواکەوتوویە، بەڵام پێم وایـە ترسـناکترین حاڵـەتی دواکـەوتوویی، کۆمـەڵگا بەگشـتییو بەتایبەت کەسانێك کە بەچاوساغو پێشڕەوی خـەڵك دادەنـرێن، لەڕووی دینداریی یەوە، بریتیە لە: دەستبەستراني زیندووان بـە فـەتوای مـردووان، ئـەوە زۆر ئیشـمان لێ تێـك دەدات، لـە بـواری ئیمانو عەقیدەو دینداریی (بەمانا تایبەتەکەی)دا، کە دەقـەکانی شـەریعەت نوقتـەیان خستۆتە سـەر پیت، ئـەوە تـەواو، پێشـینی چاكو زاناو پێشەوایان نوقتەیان بۆ خستووینە سەر پیت، بـەڵام لـەبواری کۆمەڵایـەتییو ئـابووریىو سیاسـییو پەیوەندییـەکانو مامەڵـە لەگـەڵ دنیـادا، لـەو بوارانـەدا پێویسـتییمان بـە چاوپێداگێڕانەوەی زۆرو بە ئیجتیهادی تازەو، بـە بیرکردنـەوەی نوێو، دووبارە سەرنجدانەوەی وەحیـی دەکـا، چونکە ئـەو فـەتوا کۆنانەی کـە دراون، بـۆ چارەسـەری کێشـەی دیکـەی غـەیری ئـەو

www.alibapir.net

کێشانەی ئێستای ئێمە، بە کەڵکی ئێستا نایەن، وەك زۆرجار گوتوومانە: وەڵامە کۆنەکان بە کەڵکی پرسیارە تازەکان نایەن، نابێ دەستو پێی خۆمان ببەستین، ئەگەر بمانەوێ دین بێنینەوە بۆ نێو ژین، ئەمما کەسێك بۆخۆی لەوێ دانیشتوەو دەڵێ: ئەوە حەڵاڵەو ئەوە حەرامە، ئەوە نابێ وابێ‌و، ئەوە دەبێ وابێ، بۆخۆی لەوێ دانیشتوەو، خەڵکیش حوکمی خۆی دەکاو، ئەویش بۆخۆی لەوێ فتوای خۆی دەداو، هیچیش لە واقیعەکە ناگۆڕی، ئەوە هیچ نیە، ئەوەی من دەمەوێ: ئەوەیە دین بێنینەوە نێو ژین، بۆیە دەبێ بە عەقڵێکی کراوەو ئازادەوە، تەماشای قورئانو سوننەت بکەینەوە، لەگەڵ ڕێزیشمان بۆ کەلەپووری زانایان، بەڵام لەو مەسەلانەدا کە لەسەردەمی ئەواندا نەبوونو قسەیان لێ نەکردوون، دەبێ قسەی تازەمان هەبێ، بیروبۆچوونی تازەمان هەبێ، ئیجتیهادی تازەو تێفکرینی تازەمان هەبێ.

## سێیەم: پیلانو نەخشەی ناحەزان

بەڵێ بەڕێزان! پیلانو نەخشەی ناحەزانو دوژمنانی ئیسلام، هەم هی دەرەکیی، هەم هی نێوەخۆ، گومانی تێدانیە کە ئەوەش کاریگەریی سەلبیی زۆری هەیە، لەسەر ئەوە کە نەهێڵدرێ

www.alibapir.net

تەوژمی ئیسلامیی، کاری ئیسلامیی، چ لە هەرێمی کوردستانو عێراق، چ لە غەیری ئەوێ دا، وەك پێویست گەشە بکات.

هەڵبەتە چارەسەری کرچو کاڵیی خۆمانو، دواکەوتوویی کۆمەڵگا، بەتایبەت لەڕووی فیکریی‌و هۆشیارییەوە، زیاتر ئەرکی خۆمانەو، هەرکات ئێمەش بە ئەرکی سەرشانی خۆمان هەڵسایِن، خوای میهرەبان فێڵو پیلانی ناحەزانو دوژمنانمان بۆ پووچەڵ دەکاتەوە، وەك فەرموویەتی: ﴿ وَإِن تَصۡبِرُواْ وَتَتَّقُواْ لَا يَضُرُّكُمۡ كَيۡدُهُمۡ شَيۡـًٔا ﴾ آل عمران: ١٢٠. واتە: ئەگەر ئێوە خۆڕاگرو پارێزکاربن، فێڵو پیلانەکەیان هیچ زیانێکتان پێ ناگەیەنێ.

بەڵێ: ناحەزانمان لە کەلێنو درزەکانمانەوە زەفەرمان پێدەبەن.

ameer.maktab@yahoo.com

 /AliBapir  /AliBapir  /MediaAmeerOffice

www.alibapir.net

www.alibapir.net



## دە (١٠) هۆشداریی، لەبارەی مامەڵە لەگەڵ واقیع و دەوروبەرەوە دا

بەڕێزان!

لەم تەوەری چوارەم دا زیاتر جەخت دەكەینەوە، لەسەر چۆنیەتی مامەڵەكردن لەگەڵ واقیع داو، لەو بارەوە، دە (١٠) هۆشداریی و وریاكردنەوەی گرنگ دەخەینەڕوو:

**هۆشداریی یەكەم:**

دەبێ بۆ مامەڵە لەگەڵ غەیری خۆماندا، لەگەڵ واقیع و دەوروبەردا، ڕازاوە بین بە ڕەوشتو بەها بەرزەكان:

جاری وا هەیە مرۆڤ، ئەگەر ئاگای لەخۆی نەبێ، كەسێ قسەیەكی ناشایستەی پێ دەڵێ، ئەگەر هەروەك ئەو بكات، مانای وایە هیچی زیادەی پێ نەبوو.

www.alibapir.net

ئێمـه کاتێـك دەتـوانین واقیـع بگـۆڕین، کـه لەسـەرووی ئـەو واقیعەوە بین، چاکتر بین لە خەڵکی نێو ئەو واقیعە، ئەگەر هەر وەك ئەوان بـین و، هـەر بەقـەدەر ئـەوان بـین، بەتەئکیـد بۆمـان ناگۆڕدرێ، هەمیشە ئەو کەسە دەتـوانێ دەوروبـەری خـۆی بخاتـە ژێر کاریگـەریی خـۆی، کـه لـه دەوروبەرەکەی خـۆی زیـاتری پـێ بێ، چاکتری پێ بێ.

با تەماشـای ئـەو فەرمایشـتەی پێغەمبـەر ﷺ بکـەین، زۆر جێـی سەرنجە، دەفـەرموێ: (إنكم لا تسعون النـاس بـأموالكم فليسعهم مـنكم، بَسْطُ الوجـه وحُسْنُ الخلق) أخرجـه (البـزار) في مسنده: ٩٦٥١، و (المحاملي) في (الأمالي): ١٦٨، و (الحافظ الذهبي) في سيرته (٣٠٣/٨) و (ابن الحجر) في (فتح الباري) وَحسَّنَهُ (٤٥٩/١٠).

پێغەمبـەر ﷺ دەفـەرموێ: ((ئێـوە بـە مـاڵو سـامانتان، فریـای هـەموو خـەڵکی ناکـەون، بـەڵام بـەڕووی خۆشـتانو، ڕەوشـتی جوانتان، بە فریای هەموویان بکەون)).

چـی تـێ دەچـێ مـرۆڤ لەگـەڵ هـەموو کـەس ڕووی خـۆش بـێ، ڕەوشتی جوان بێ، بۆ هـەمووان دڵسۆز بـێ، لەگـەڵیان بـە ڕەحـم بـێ، کـە ئەوانـە هـەموویان واجـبن، لـە بـواری مامەڵـە لەگـەڵ دەوروبەرماندا.

www.alibapir.net

**هۆشداریی دووەم:**

هاوکـــاریی کـــردن لەگـــەڵ دەورووبـــەرمان دا، لەســـەر خاڵـــە هاوبەشەکان:

خوای دادگەرو کارزان دەفەرمویٚ: ﴿وتعاونوا على البر والتقوى﴾ (المائدة:٢)، واتە: لەسەر چاکەکارییو پارێزکاریی پێکەوە هاوکارو دەستبارگربن.

ئەم ئایەتە لە سیاقێکدا هاتوە، کە باسی موشریکەکان دەکا، کە ئەمە دەقەکەیەتی:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تُحِلُّواْ شَعَٰٓئِرَ ٱللَّهِ وَلَا ٱلشَّهْرَ ٱلْحَرَامَ وَلَا ٱلْهَدْىَ وَلَا ٱلْقَلَٰٓئِدَ وَلَآ ءَآمِّينَ ٱلْبَيْتَ ٱلْحَرَامَ يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِّن رَّبِّهِمْ وَرِضْوَٰنًا ۚ وَإِذَا حَلَلْتُمْ فَٱصْطَادُواْ ۚ وَلَا يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَـَٔانُ قَوْمٍ أَن صَدُّوكُمْ عَنِ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ أَن تَعْتَدُواْ ۘ وَتَعَاوَنُواْ عَلَى ٱلْبِرِّ وَٱلتَّقْوَىٰ ۖ وَلَا تَعَاوَنُواْ عَلَى ٱلْإِثْمِ وَٱلْعُدْوَٰنِ ۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴿٢﴾ ﴾ المائدة

کەواتـــە: مەبەســـت مامەڵـــە کردنـــە لەگـــەڵ موشـــریکەکان دا، کـــە تێیـــدا دەفـــەرموێ: ئـــەی بڕواداریـنـــە! بـــەهۆی ئـــەوەوە کـــە

www.alibapir.net

موشریکەکان ئێوەیان لە مزگەوتی (حەرام) گێڕایەوە، با ئەو ڕەفتارەیان واتان لێ نەکا، ئێوەش دەستدرێژییان بکەنە سەر و بیانگێڕنەوە لە مزگەوتی (حەرام)، ئێوە وەك ئەوان مەکەن، دوایی دەفەرموێ: هاوکاریی یێکەوە بکەن لەسەر چاکەکاریی و پارێزکاریی، (لەگەڵ نامسوڵمانانیشدا).

### هۆشداریی سێیەم:

تەبایی و ئاشتیی، بناغەی هەر گۆڕانکاریی و گەشەکردنێکە:

با ئێمە هەمیشە موشتەری ئەوە بین، کۆمەڵگا ئاشتەوایی تێدا بێ، تەبایی تێدا بێ، چونکە بەبێ ئەوە هیچمان بۆ ناکرێ، خەڵکی دیکە بە زۆریی ئەو پەندانەیان بەسەردا دەچەسپێن: (ڕاوچی خراپەو لە ئاوی لێڵدا ڕاوێ دەکا)، (دزەو بازاڕی ئاڵۆزی دەوێ)، بەڵام ئێمەی دیندارو مسوڵمان، ئێمەی کە دەمانەوێ حەق بچەسپێ، ئێمە بەس لە کەشێکی ئارام و ئاشتیی و هێمندا، کارمان دەڕوا، بەڵام ئەوان لە کەش و هەوای شەڕو کێشەو سەنگەر لێکدی گرتن دا: جا چ شەڕی سیاسیی بێ، شەڕی ئیدۆلۆژیی بێ، چ جەنگ و کوشتار، قازانج دەکەن، چونکە کەسێك کە ناحەقی هەبوو، دەبێ پەنا بەرێتە بەر شێوازی

www.alibapir.net

ناحـەق، هەمیشـە ئامانجـت چـۆن بـێ، ئـەو ئامانجـە، شـێوازو ئامرازی وەك خۆی پەلكێش دەكا، ئەگەر ئامانجت حەق بێ، بۆی بەدوای ئـامرازو شـێوازی حەقـدا دەگـەڕێی‌و، ئەگـەر ئامانجیشـت ناڕەوابێ، بەڕێبازی ناڕەوادا بۆی دەچی!

**هۆشداریی چوارەم:**

ئامانجی دنیایی كاری ئیسلامیی، خزمەتە بە خەڵك‌و وڵات:

ئامانجی قیامەتیی دیارە: ڕازیی كردنی خوای پەروەردگارو بەندایەتیی كردنە بۆ خوا، بەڵام ئامانجی دنیایی كاری ئیسلامیی، خزمەتە بە خەڵك‌و نیشتیمانییان، ئەو خەڵكەی كە لەگەڵدا دەژین، پێغەمبەرانی ئێمە (صەڵاتو سەلامی خوایان لەسەر بێ) وایان كردوە، یانی: پێغەمبەران كە بە قەومەكانی خۆیان دەڵێن: ﴿ وَأَنَا۠ لَكُمۡ نَاصِحٌ أَمِينٌ ﴾ (الأعراف: ٦٨)، ڕاستیان فەرموە، (ناصح) كێیە؟ (النصح إرادة الخیر للمنصوح)[1]، (نصح) ئەوەیە: چی بۆ ئەو چاكە، ئەوەت بۆی بوێ، ئنجا ئەو زاتانە لە لووتكەی ڕاستیی دا بوون، مادام وایان بە گەلە كافرەكانی خۆیان

---

[1] مفردات ألفاظ القرآن ، راغب الأصفهاني، ص ٥/٤، ط ٢٠١٢ م ، المكتبة العصرية.

www.alibapir.net

گوتوه، دیاره وابوون: ﴿ وَأَنَا۠ لَكُمۡ نَاصِحٌ أَمِينٌ ﴾، واته: من بۆتان دڵسۆزو، لەگەڵیشتان ئەمیندارمو، خیانەتتان لێ ناکەم.

ئنجا با تەماشای ئەم ئایەتەی سوورەتی (الممتحنة) بکەین:

﴿ لَّا يَنۡهَىٰكُمُ ٱللَّهُ عَنِ ٱلَّذِينَ لَمۡ يُقَٰتِلُوكُمۡ فِي ٱلدِّينِ وَلَمۡ يُخۡرِجُوكُم مِّن دِيَٰرِكُمۡ أَن تَبَرُّوهُمۡ وَتُقۡسِطُوٓاْ إِلَيۡهِمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُقۡسِطِينَ ﴿٨﴾ ﴾ (الممتحنة: ٨)، واته: (ئەی مسوڵمانینە!) ئەوانەی لەسەر دینتان دژایەتییتان ناکەنو، لە نیشتیمانی خۆتان وەدەرتان نانێن، خوا ڕێتان لێ ناگرێ کە لەگەڵیاندا چاکەکاربنو بەخشەربن، بەدڵنیایی خوا بەخشەرانی خۆشدەوێن.

**هۆشداری پێنجەم:**

تەبەنیی کردنی کێشەکانی خەڵکو خۆ لێ کردنە خاوەنیان:

ئەوەش مەسەلەیەکی زۆر گرنگە، کارمان بەوەندە تەواو نابێ: لە زاتی خۆماندا پاکو چاکو ڕێکو صافو خواناس بین، لە ڕاستیی دا بە خەم خەڵکەوە بوونو، گرنگیی پێدانیانو مشوورلێخواردنیشیان، طاعەتێکی گەورەو گرنگە، ئەوە

www.alibapir.net

لەلایەکەوەو لەلایەکی دیکەشەوە: خەڵك عەقڵی لە چاوان دایەو، بەڵکو عەقڵی لە گوێی دایەو، گوتراوە: (المحتاج أعمى إلا عن حاجته)، کەسێك پێویستییەکی هەبێ، بەس پێویستییەکەی خۆی لەبیرە، لە کوردەواریش دا باوە: لە کابرایەکی برسی بپرسە: دوو کۆ دوو (٢+٢) دەکاتە چەند؟! دەڵێ: دەکاتە چوار (٤) نان، چوار کولێرە، هەر مەبەستەکەی خۆی دەبینێ.

زۆر گرنگە ئێمە خۆمان لە خەڵك، لە کێشەکانی خەڵك بکەینە خاوەنو، لەسەرمانە خاوەنداریێتیی خەڵك بکەین، زۆرجار بیردەکەمەوە دەڵێم: خوایە! میللەتێکی مسوڵمان، ئەو هەموو خەباتەی کردوە، ئێستا تەماشای ئەو چینە سیاسییە بکە، ڕەنگە ئەوەی کە لە هەمووان ئەهوەنتر بێ، ئەوەبێ کە دوو ڕکات نوێژ بکات، یان نا، ئەمما باسی ئایەتو حەدیسو شەریعەت، ئەوە هیچ، زۆربەشی: نە نوێژی هەیە، نە ڕۆژووی هەیە، بەڵکو زۆریشی گیرۆدە بووە بە گوناهە گەورەکانەوە: ئەگەر داوێن پیسییە، ئەگەر قومارە، ئەگەر شەڕاب خۆرییە... هتد، ئنجا ئایا حەیف نیە ئێمەی ئیسلامیی تێوە ڕامێنین، ئەوانە سەرپەرشتیی ئەو خەڵکە مسوڵمانە بکەن؟ ئایا خەڵکەکە ئەوەی دەوێت؟! ئایا ئەوانە تا ئێستا لەماوەی ساڵانی ڕابردوودا، خەڵکیان بەچی گەیاندوە؟ نەك هەر لەم بەشەی کوردستان، لە

www.alibapir.net

بەشەکانی دیکەش دا، تەماشا بکەن! پارتی سیاسی وا هەیە لە هەندێك لە بەشەکانی دیکەی کوردستان، ئیلحادیان بە فەڕمیی تەبەننیی کردوە! نکوولّیی دەکەن لە بوونی خواو پێغەمبەرو ئیسلام! چۆن دەبێ لەوە ڕابمێنین؟ چۆن دەبێ ئەو خەڵکە خۆی لێ نەکەینە خاوەن؟ بە تەئکید ئەوە ئەرکێکی شەرعییمانە.

لێرەدا پێم خۆشە ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەرتان ﷺ بۆ بهێنمەوە:[1]

(أحبُّ الناس إلى الله: أنفعهم، وأحب الأعمال إلى الله عز وجل: سرورٌ تدخِلُهُ على مسلم، أو تكْشِفُ عنه كربةً، أو تقضي عنه ديناً، أو تطرد عنه جوعاً، وَلأن أمشي مع أخي المسلم في حاجة، أحَبُّ إليَّ من أن أعتكف في المسجد شهراً، وَمَنْ كَفَّ غَضَبَهُ، سَتر الله عورتهُ، وَمَنْ كَظَم غيظاً، ولو شاء أن يُمْضيه أمضاه، ملأَ الله قَلْبَهُ رضىً يوم القيامة، ومَنْ مشى مع أخيه المسلم في حاجته، حتى يُثبتها له، أثبت الله تعالى قَدَمَهُ يوم تَزِلُّ الأقدام، وإنَّ سوءَ الخُلُقِ لَيُفْسِدَ العَمَلَ، كما يُفْسِدُ الخَلُّ العَسَلَ).

ameer.maktab@yahoo.com

 /AliBapir  /AliBapir  /MediaAmeerOffice

www.alibapir.net

[1] صحيح الجامع: ١٧٦، وإبن أبي الدنيا في (قضاء الحوائج) ص ٤٧، برقم: ٣٦، و الألباني في (السلسلة الصحيحة) برقم: ٩٠٦.

www.alibapir.net

واته: خۆشەویسترین کەس لەلای خوا، سوودبەخشترینیانە بۆ خەڵك‌و، خۆشەویسترین کار لەلای خوا: دڵخۆشییەکە بیخەیە دڵی مسوڵمانێکەوە، یان خەمێکی لێ بڕەوێنی، یان برسییەتییەکی لێ لابەری (و، تێری بکەی) یان قەرزێکی بۆ بدەیەوە، ئەگەر سەعاتێك بە ئیشی برایەکی مسوڵمانەوە بڕۆم، لەلام خۆشەویستترە لەوەی لەم مزگەوتەمدا مانگێك بچمە ئیعتیکافەوە، (چونکە جاری وایە سەعاتێك بە ئیشی برایەك، بە ئیشی خوشکێکەوە دەڕۆی، لە هەموو تەمەنی دا سوودمەند دەبێ لێی‌و، بەختەوەر دەبێ)، هەر کەسێك تووڕەییەکەی خۆی بگێڕێتەوە، (جێ بەجێ ی نەکا) خوا عەیبی دەپۆشێ‌و، هەرکەسێك ڕقی پەنگ خواردووەی خۆی کپ بکاتەوە، ئەگەر بشیەوێ دەریبڕێ، بتوانێ دەری ببڕێ، خوا لە ڕۆژی قیامەتدا دڵی پڕ دەکا لە ڕازیبوون، هەرکەسێکیش بەدەم کاری برایەکیەوە بچێ، هەتا بۆی دەچەسپێنێ، لەو ڕۆژەدا کە پێیەکان دەخلیسکێن، خوا پێی دەچەسپێنێ، بێگومان ڕەوشتی خراپ، (کردەوەو ئاکاری خراپ) کردەوەی چاك تێك دەدا، وەك چۆن سرکە (خل) هەنگوین تێك دەدات.

ameer.maktab@yahoo.com

 /AliBapir  /AliBapir  /MediaAmeerOffice

www.alibapir.net

www.alibapir.net

**هۆشداریی شەشەم:**

**هەڵوێست هەبوون لەبەرامبەر ستەمو قۆرخکاریی‌و گەندەڵییدا:**

مسوڵمان نابێ بێ هەڵوێست بێ لەبەرامبەر زوڵمدا، لەبەرامبەر قۆرخکاریی‌و گەندەڵییدا، ئەو پێغەمبەرانە (صەلاتو سەلامی خوایان لەسەر بێت) بەر لەهەر شتێك بە تەوحیدەوە هاتوون، بەلاّم ئەوە کە تەنیا خوا بپەرسترێ‌و، بەندایەتیی بەس بۆ خوا بکرێ، خوازیاری دادگەرییە، خوازیاری ئەوەیە کە خەڵك زوڵمێ لە یەکدی نەکەن، خوازیاری ئەوەیە کە خراپەو فەساد نەبێ، خوازیاری ئەوەیە کە نیعمەتەکانی خوا بۆ هەموو بەندەکانی خوا بن، هەربۆیەش دوژمنانی پێغەمبەران (صەلاتو سەلامی خوایان لەسەر بێ) کێ بوون بە پلەی یەکەم؟ خۆبەزلگران (المستكبرون) و خۆشگوزەرانان (المترفون)و زێدەڕۆییکاران (المسرفون)، ئەوانە بوون، خۆ خەڵکی ڕەش‌و ڕووت نەبووە، خەڵکە ڕەش‌و ڕووتەکە، چەواشەکراوو هەڵخەڵەتاو بووە، بەکارهێندراوە، کراوەتە سووتەمەنیی، بەلاّم دوژمنی سەرسەختی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام): ﴿الملأ الذین استكبروا﴾ بوون، ئەو خۆ بەزلگرانە بوون، ئەو دەستڕۆیشتووانە، ئەو قۆرخکەرانەی دەسەلاّتو سامان (سلطة و ثروة)، کە لەلایەن ئەوانەوە قۆرخ کرابوون، ئەوانە دوژمنی سەرسەختی

www.alibapir.net

پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) بوون، چونکە زانیویانە ئەگەر ئەو پەیامە تەوحیدییەی پێغەمبەران بچەسپێ، ئەوان ئەو ڕاوەیان لێ تێك دەچێ، ئەو بەزمو بازاڕەیان کۆتایی پێ دێ.

خوای پەروەردگاریش لە ئایەتی (٢٧٠)ی سورەتی (البقرة)دا دەفەرموێ: ﴿ لَا تَظۡلِمُونَ وَلَا تُظۡلَمُونَ ﴿٢٧٩﴾ ﴾ (البقرة: ٢٧٩) ،

واتە: نە زوڵم دەکەن و نە زوڵمیشتان لێ دەکرێ.

هەروەها خوای کاربەجێ بە پرسیارکردنی نکوولێیلێکەرانە، دەفەرموێ: ﴿ وَمَا لَكُمۡ لَا تُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱلۡمُسۡتَضۡعَفِينَ ﴾ النساء: ٧٥، واتە: ئەوە چیتانە! بۆچی لە پێناوی خواو لە پێناوی چەوسێندراواندا خەبات ناکەن!!

**هۆشداریی حەوتەم:**

هاوسەنگیی ڕاگرتن لە نێوان کۆمەڵگاو نەتەوەو ئوممەت دا:

کۆمەڵگاکەمان ئەوەی کە تێیدا دەژین، نەتەوەکەشمان وەك نەتەوەی کورد، کە نەتەوەیەکی مەزلوومو مەحرووم، هەروەها ئوممەتی ئیسلامیش، دەبێ ئاگامان لە هەموویان بێت، چونکە ئێمە بەشێکین لە نەتەوەیەکی مەزلووم کە نەتەوەی کوردەو،

www.alibapir.net

بەشێکیشین لە ئۆممەتێکی ستەملێکراو و داپڵۆسێنراو، کە ئۆممەتی ئیسلامییە، ئنجا دەبێ هاوسەنگیی (إتزان) ڕابگرین لە نێوان جێ بەجێ کردنی ئەرکی سەرشانمان بەرامبەر بە کۆمەڵگای خۆمان و، مشوورخۆریی‌و دڵسۆزییشمان هەبێ لەگەڵ نەتەوەکەی خۆمان دا، هەروەها لەگەڵ ئۆممەتیشدا بەجیاوازیی سەرجەم پێکهاتەکانیەوە، لە کۆمەڵگاو نەتەوەکان، کارلێک‌و خەمخۆریی‌و دڵسۆزیی نواندن‌و بەرگریی لێکردنمان هەبێ.

ئەم ئایەت‌و فەرمایشتانەش بەڵگەی ئەوەن کە گوتمان، هەرچەندە هەر مەسەلەیەك بە عەقڵ‌و فیطرەت‌و ڕۆشن بێ، حەوجێی بە بەڵگەی نەقلیی ناکات:

١- ﴿ وَٱلۡمُؤۡمِنُونَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتُ بَعۡضُهُمۡ أَوۡلِيَآءُ بَعۡضٖۚ ﴾ التوبة: ٧١.

واتە: پیاوانی بڕوادار و ئافرەتانی بڕوادار دۆست و پشتیوان و هاوکاری یەکدیین.

٢- ﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن رَّسُولٍ إِلَّا بِلِسَانِ قَوۡمِهِۦ لِيُبَيِّنَ لَهُمۡۖ ﴾ إبراهيم: ٤

واتە: هیچ پێغەمبەرێکمان نەناردوە، مەگەر بە زمانی خەڵکەکەی تاکو بۆیان ڕوون بکاتەوە.

www.alibapir.net

٣- (الـدين: النصـيحة، قلنـا: لمـن يـا رسـول الله؟ قـال: لله ولكتابـه ولرسوله ولأئمة المسلمين وعامتهم) رواه مسلم: ٥٥.

واته: دینداریی دڵسۆزییه، گوتمان: بۆ كێ ئەی پێغەمبەری خـوا؟ فـەرمووی: بـۆ خـوا و بـۆ كتێبەكـەی و بـۆ پێغەمبەرەكـەی و بـۆ پێشەوایانی مسوڵمانان و بۆ تێكڕایان.

٤- (كُلُّكُـمْ رَاعٍ وَكُلُّكُـمْ مَسْؤول عَـنْ رَعِيَّتِـهِ) رواه البخـاري: ٨٩٣، و مسلم: ١٨٢٩.

واتـــه: هـــەر كامتـــان چـــاودێرە و بەرپرســـیارە بەرانبـــەر بـــە خەڵكەكەی.

ameer.maktab@yahoo.com
 /AliBapir  /AliBapir  /MediaAmeerOffice
www.alibapir.net

**هۆشداریی هەشتەم:**

كەمینەكانی وڵات، دەبـێ مـافو ئازادییـەكانیان دەسـتەبەركراو و پارێزراو بن:

بــەڵێ ســەرجەم پێكهاتــەكانی كۆمەڵگایەكــەمان، خــاوەنی هــەر ئایینو ئینتیمایەكی نەتەوەیی بن، دەبێ كار لەسەر ئەوە بكـەین كـە ڕێـزو ئـازادییو مافەكانیان بـۆ دابـین بكـرێن، چـونكە ئـەوە ئــەركێكی شــەرعییە و، بەكەمتەرخــەمیی تێــداكردنی گوناهبــار

www.alibapir.net

دەبین، ئەوە لەلایەکەوە و لە لایەکی دیکەشەوە: با چیدی حیزبە عەلمانییەکان نان‌و پیاز بەوەوە نەخۆن‌و، ڕۆژئاوا بترسێنن لەوەی کە ئەگەر ئیسلامییەکان دەسەڵاتیان بێ، ئێزیدیی وایان لێ دێ‌و، نەصرانیی وایان لێ دێ! لەحاڵێکدا کە ئێمە بۆخۆمان لە ئێزیدیی‌و نەصرانییەکان ستەملێکراوترین بەدەستیانەوە! کەچی دەزانم ئەوانە لەلای ڕۆژئاواییەکان: بەرگریی کردنیان لە کەمینەکان دەکەنە پاساوی مانەوەی خۆیان، دەڵێن: با ئێمە هەبین، چونکە ئەگەر ئیسلامییەکان دەستیان بڕوات، ئەو کەمایەتییە دینییانە دەهاڕن، دەیانفەوتێنن! کە ئەوەش هەمووی بانگەشەی ناحەزانەیە، بۆیە گرنگە ئێمە لە پەیامی خۆماندا، لە ڕاگەیاندنی خۆماندا، وەك شەریعەت دەڵێ، وەك پێغەمبەر ﷺ کردوویەتی، مامەڵەی چۆن بووە لەگەڵ جوولەکە، لەگەڵ نەصرانیی، لەگەڵ موشریك، لەگەڵ مونافیق، لەگەڵ نامسوڵمانان دا بە گشتی، مامەڵەی چۆن بووە، ئێمەش گرنگە ئەوە دەربخەین، بۆ ئەوەی هەم ئەرکی سەرشانمان بەرانبەر بەو مرۆڤانە، بەرانبەر بەو بەندانەی خوا، جێ بەجێ بکەین و، چی دیکەش نان‌و پیاز بە ئەوەوە نەخورێ.

بناغەی مامەڵەش لەگەڵ کەمینە و پێکهاتەکانی کۆمەڵگای مسوڵمان دا، بریتیە لەو بنچینە شەرعییەی لە فەرمایشتی

www.alibapir.net

پێغەمبەردا ﷺ هاتوە: (لهم ما لنا وعليهم ما علينا)، واتە: ئێمە (ی مسـولمان) چ مافێکمان هەیە، ئەوانیش هەیانەو، چ ئەرکێکمان لەسەرشانە، ئەوانیش لەسەریانە. وەك لە: (مجموعة الوثائق)دا هاتوە.[1]

ئەمە لەو (وثيقة)یەدا هاتوە: ( ... لأني أعطيتهم عهد الله، على ان لهم ما للمسلمين، وعليهم ما على المسلمين، وعلى المسلمين ما عليهم، بالعهد الذي استوجبوا به حق الذّمام والذبَّ عن الحرمة..)

شایانی باسە کە لە کتێبی چوارەمی مەوسووعەی: (ئیسلامو دەوڵەتداریی)دا بەناوونیشانی: (نا مسولمانان لە کۆمەلگاو دەوڵەتی ئیسلامیی دا) بەدرێژیی لەو بارەوە دواوین، هەروەها لە کتێبی پێنجەمی مەوسووعەی: (بیرکردنەوەی ئیسلامیی لەنێوان وەحییو واقیع دا)، بەشێکمان بۆ ئەو مەسەلەیە تەرخان کردوە.

ameer.maktab@yahoo.com

 /AliBapir  /AliBapir  /MediaAmeerOffice

www.alibapir.net

[1] بڕوانە: (مجموعة الوثائق السياسية للعهد النبوي والخلافة الراشدة)، محمد حميدالله. الوثيقتان: ٩٦ ، ٩٧، نسختان لمكتوب النبي إِلى نجران، ص١٨٩،١٨٨.

www.alibapir.net

**هۆشداریی نۆیەم:**

گرانەوە بەڕووی مرۆڤایەتیی دا، لەڕووی ئاشنایی‌و بەهرە لێ وەرگرتن‌و، سوود پێ گەیاندنیشیانەوە:

ئێمە دینەکەمان دینێکی عالەمییە، بەڵێ ئێمە ئێستا دواکەوتووین‌و بێ سەرو وڵاتین، بەڵام گرنگە ئێمە کە قسە دەکەین، لە ڕاگەیاندنمان دا، ئەوە پێشان بدەین کە ئێمە داخراو نین‌و، هەموو بەشەرییەت بە زادەی خێزانێك دەزانین، هی دایك‌و بابێکن، زۆرجار ئەو میوانە بیانییانەی سەردانمان دەکەن، پێیان دەڵێم: ئێمە هەمووومان براو خوشکی یەکدین، هەموومان دەچینەوە سەر ئادەم‌و حەوا، لەڕووی ڕەچەڵەکی دوورەوەو، لەڕووی نەسەبی مرۆییەوە، هەموومان خوشك‌و براین‌و یەك خێزانین، وەك خوای دادگەر فەرموویەتی: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقۡنَٰكُم مِّن ذَكَرٖ وَأُنثَىٰ وَجَعَلۡنَٰكُمۡ شُعُوبٗا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓاْۚ إِنَّ أَكۡرَمَكُمۡ عِندَ ٱللَّهِ أَتۡقَىٰكُمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٞ ١٣ ﴾ الحجرات: ١٣.

واتە: ئەی خەڵکینە! ئێمە لە نێر و مێیەك دروستمان کردوون و گێڕاومانن بە چەند نەتەوە و هۆزێك، تاکو پێك ئاشنابن، بەڕێزتان لای خوا پارێزکارترتانە، بێگومان خوا زانای شارەزایە.

www.alibapir.net

**١٠) هۆشداریی دەیەم:**

بناغەی مامەڵە لەگەڵ ئەوانی دیکەدا، خاڵە هاوبەش‌و بەها مرۆییەکانن:

لێمان تێك نەچێ، کە کەوتینە قسە لەگەڵ نامسوڵمانانندا، ئەگەر جوولەکەیە، ئەگەر نەصرانییە، ئەگەر ڕۆژهەڵاتییە، ئەگەر ڕۆژئاواییە، ئەوەی نامسوڵمانە، نابێ بڵێین: قورئان‌و سوننەت وا دەفەرموون، چونکە قورئان‌و سوننەت مەرجیعی ئێمەیە، هی ئەو شتێکی دیکەیەو، دەبێ بگەڕێین بۆ خاڵی هاوبەش، بەڵگەش لەوبارەوە وێڕای دەلالەتی عەقڵ‌و فیطرەت، ئەم ئایەتەیە: ﴿ قُلْ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ تَعَالَوْا۟ إِلَىٰ كَلِمَةٍ سَوَآءٍۭ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ ﴾ ( آل عمران: ٦ )، واتە: بڵێ: ئەی خاوەن کتێبینە! وەرن بۆ خاڵێکی هاوبەش کە بۆ هەمووومان وەك یەکە، (واتە ئێوەش وەك ئێمە ئیعتیڕافی پێ دەکەن)، ﴿ أَلَّا نَعْبُدَ إِلَّا ٱللَّهَ وَلَا نُشْرِكَ بِهِۦ شَيْـًٔا وَلَا يَتَّخِذَ بَعْضُنَا بَعْضًا أَرْبَابًا مِّن دُونِ ٱللَّهِ ﴾ (آل عمران: ٦٤)، کە جگە لە خوا نەپەرستین‌و، هیچ شتێك نەکەینە هاوبەشی‌و، هەندێکمان هەندێکمان لە جیاتی خوا نەکەینە سەرۆك‌و مشوورخۆر.

ameer.maktab@yahoo.com
/AliBapir /AliBapir /MediaAmeerOffice
www.alibapir.net

www.alibapir.net

ئنجا (وثيقـة)ی مەدينـە، پێغەمبـەر ﷺ یـەك ئایـەتی تێـدا نەهێناوەو، یەك فەرمایشتی –وەك قسەی تایبـەتیی خۆی- تێدا نـەهێناوە، چـونكە ئـەوكات جوولەكـەو نەصـرانیی، دەیـانگوت: ئەوە قورئانو سوننەتەو بۆ ئێوەیـەو، مـەرجیعی ئێمـە پـەیمانی كۆنە، دەقێكی تەورات، یان ئینجیل بێنە!

سـەرنجی بڕگـەكانی (وثیقـة)ی مەدینـە بـدەن، هـەموویان خـاڵی هاوبەشن، بەها مرۆییـەكانن، ئەوانـەن كـە هـەموویان لەسـەریان پێك دەگەن.

بۆ مامـەڵە لەگەڵ غـەیری خۆمانـدا، دەبـێ بگەڕێینـەوە بـۆ خاڵـە هاوبەشەكان، ئەوەی كە مـەڕجیعی هەموو لایەكە، نـەك ئـەوەی تـەنیا مـەڕجیعی خۆمانـە، هەرچـەندە بـە دڵنیاییـەوە، هەرچـی بـەهای مرۆییـە، هەرچـی شـتی باشـە، هـەمووی لـە قورئـانو سوننـەتدا هەیە، بـەلام لەكاتێكدا مامەڵـە لەگـەڵ نامسوڵمانان دا دەكەین، دەبێ مەڕجیع شتێك بێ، كە ئـەویش دانـی پێدا بێنـێ، (علي بـن أبـي طالـب) خـوا لێـی ڕازی بـێ گوتوویـەتی:.(حَـدِّثوا النـاس بمـا يعرفـون، أتحبـون أن يُكَـذَّبَ الله و رسـوله؟)[1]. واتـە: بـە گـوێرەی عـەقڵی خـەڵك بـدوێن، ئایـا حـەز دەكـەن خـواو پێغەمبەرەكەی بە درۆ دابنرێن؟!

---

[1] صحیح البخاري: ١٢٧.

www.alibapir.net

کۆتایی ئەم تەوەرەش بەم فەرمایشتەی پێغەمبەر ﷺ دێنین کە دەفەرموێ: (لقد شهدت مع عمومتي في دار عبدالله بن جدعان حلفا، ما أُحِبُّ أن لي به حُمْرَ النعم، ولو دعيتُ به في الإسلام لأجَبْتُ) رواه ابن إسحاق في السيرة بسندٍ صحيح[1]، وهو مرسل لكن الألباني صحَّحه بشواهده في تخريج (فقه السيرة).

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: لەگەڵ مامەکانم لە ماڵی (عبدالله بن جدعان)دا ئامادەی پەیمانێك بووم، حەزناکەم کە ئەو پەیمانەم نەبووایەو، حوشتری سپییم هەبووایەو، ئەگەر لە ئیسلامیش دا بۆ پەیمانێکی ئاوا بانگ بکرێم، وەڵامی دەدەمەوە.

ئەو پەیمانەش بریتی بووە لەوە کە نەهێڵن کەس زوڵمی لێ بکرێ لە شاری مەککەداو، هەر کەسێك حەقێکی هەبوو، حەقەکەی بۆ وەربگیرێتەوە.

ئێمەش بە دڵنیایی وەك ئیقتیدا بە پێغەمبەری خۆمان ﷺ دەبێ لەگەڵ هەرکەسێکدا بین، کە قسەیەکی حەق دەکاتو، هەوڵ دەدا بۆ دادگەریی، هەوڵ دەدات بۆ چاکەو، دەستی هاوکاریی‌و دەستی دەسبارگرتنمان لە هی هەموو کەس درێژتر

---

[1] السيرة النبوية لابن هشام ، ج١ ص ٧٢، و البداية والنهاية لابن كثير ، ٢٩٣/٢ و تأريخ ابن خلدون ٤٠٤/٢ .

www.alibapir.net

بـێ، ئەگـەر بمانـەوێ ئـەم كـارو پـڕۆژە ئیسـلامییە زیـاتر وا لێ بكەین، ببێتە جێ ئومێدو هیوای خەڵكو، خەڵك زیاتر دڵی پـێ خۆش بكات، پاشان ئەو تەمو مژانـەش كـە لـە دەورمـان دروسـت كـراون، لەلایـەن عەلمانییەكانـەوە، بیانڕەوێنینـەوە، ئـەویش بـە هەڵوێستی سیاسیی‌و بە كردەوە، ئەو تەمومژانە بڕەوێنینەوە بۆ ئەوەی هەموو لایەك وێڕای ئەوەش بزانن: ئەو ئیسلامەی ئێمـە دەمانەوێ، سایە و سێبەر بێ، بەرنامەیەكە بەرژەوەندیی هـەموو خەڵكی تێدایە، چونكە پێشـێ ڕەزامەنـدیی خـوای تێدایـە، ئنجـا دادگەرییـەكی تێدایـە، كـە ئـەو دادگەرییـە لـە قـازانجی هـەموو لایەكە.

ameer.maktab@yahoo.com

 /AliBapir  /AliBapir  /MediaAmeerOffice

www.alibapir.net

www.alibapir.net

تەوەری پێنجەم

## حەوت مەسەلەی هەستیاری کاری ئیسلامیی

بەڕێزان!

خوا پشتیوان بێ، ئێمە لەم تەوەری کۆتاییەدا، هەڵوەستە دەکەین لەبەردەم حەوت (٧) مەسەلەی هەستیار دا، کە مشتومڕی زۆریان لەسەر کراوەو دەکرێ، لەبواری کارو پڕۆژەی ئیسلامیی دا، هەڵبەتە وەك لە ڕابردوودا گوتم، جارێکی دیکەش جەختی لەسەر دەکەمەوە: ئەوەی کە دەیڵێم، هەڵهێنجان و تێگەیشتنی بەندەیە لە قورئان و سوننەت و، لەبەر ڕۆشنایی ئەو واقیعەدا کە تێیدا دەژین و، دوای سەرنجدانی کاروئەزموونی زۆربەی ئەو لایەنە ئیسلامییانەی کە لە جیهانی ئیسلامی ئەمڕۆدا هەن، هەر لە هیندو پاکستانەوە تاکو دەگاتە مەغریب.

### مەسەلەی یەکەم: بانگەواز و سیاسەت، دوو شتی تێکهەڵکێشن:

بەبێ پێشەکی دەچینە نێو باسەکەمانەوەو دەڵێم: ڕای ڕاست – بەلای منەوە – ئەوەیە کە بانگەوازو سیاسەت: (الدعوة

www.alibapir.net

والسياسة)، دوو شتی تێك هەڵكێشن، نەك دژو ناكۆك، یاخود جیاواز لە یەكدی.

لەو بارەوە مشتومڕی زۆر كراوەو ئێستاش دەكرێ، دەگوترێ: كەسانێك كە كاری پەروەردەو بانگەوازو فێركردن دەكەن، جیان لەوانەی كە كاروجموجوڵو چالاكیی سیاسیی دەكەنو، واباشترە لەیەك جیابكرێنەوە! هەڵبەتە نالێم: ئەگەر لێك جیابكرێنەوە، ناشەرعییە، هەروەها دەشزانم كە: ئەوانەی كە كارو جموجوڵو چالاكیی سیاسیی دەكەن، پێویستییان بە شێوازو ئامرازی جیاوازە، لەوەی كە كاری پەروەردەیی‌و بانگەوازو فیكریی دەكەن، نكوولّیی لەوە ناكرێ، بەڵام من وای تێگەیشتووم: بانگەوازو سیاسەت، دوو شتی تێك هەڵكێشن، دوو شتی تەواوكەری یەكدینو، تێك ناگیرێنو، پێویستە پێكەوە بنو تێكهەڵكێش بن، بەلای كەمەوە لەبەر چوار هۆكاران:

<u>یەكەم</u>: ئامانجی دووری كاری سیاسیی، بریتییە لە دروستكردنی دەوڵەتو، سەرەكییترین ئەركی سەرشانی دەوڵەتیش ئەوەیە كە دوای ئەوەی شەریعەت پیادە دەكات، بەسەر ئەو كۆمەڵگایەدا، كە تێیدا دەست ڕۆیشتوویە، پەیامی خوای پەروەردگاریش دەگەیەنێ بە غەیری خۆی، بە دەرەوەی خۆی، پێغەمبەری خاتەم ﷺ وای كردوە، لەو شوێنەی كە دەسەڵاتی هەبووە،

www.alibapir.net

شەریعەتی پیادە كردوە بەسەر مسوڵمانان دا، چونكە: جێ بەجێ كردنی شەریعەتیش دەبێ كۆمەڵگا خۆی داوای بكا، نەك بەسەریدا فەرز بكرێ، دەبێ لەپێش دا كۆمەڵگا دروست بێ و، ئەو كۆمەڵگایە خۆی پێی خۆش بێ شەریعەتی بەسەردا جێ بەجێ بكرێ، ئنجا جێ بەجێ دەكرێ، ئەگەرنا ناگونجێ كۆمەڵگایەك، خەڵكێك شەریعەتیان نەوێ، بەزۆر بەسەریان دا فەرز بكرێ!

گرنگ ئەوەیە دەوڵەتی ئیسلامیی، یەكێك لە ئەركە گەورەكانی سەرشانی لە دەرەوەی خۆی، بریتیە لە گەیاندنی پەیامی خوا بە خەڵكی، پێغەمبەر ﷺ وای كردوە، پێ بەپێ هەتا زیاتر دەستی ڕۆیشتوە، بانگی ئەو خەڵكەی دیكەی كردوە بۆ ئیسلام، باوێنەیەك لە سیرە بێنینەوە، كە لە (صحيح البخاري) و (صحيح مسلم)دا هاتوە[1]:

دوای ئەوەی لە جەنگی ئەحزاب دا، جوولەكەكانی خەیبەر پەیمانیان شكاند، پەیمانیان هەڵوەشاندەوەو غەدریان كرد، پێغەمبەر ﷺ بەرەو قەڵاكانی خەیبەر چوو، ماوەیەك قەڵاكانیان ئابڵووقەدان، بەڵام قەڵایەكی مەحكەمیان هەبوو، بۆیان نەگیرا، ئنجا فەرمووی: (لأعطين الراية غداً رجلاً يحب الله

---

[1] صحيح البخاري: ٣٧٠١، و صحيح مسلم: ٢٤٠٦ .

www.alibapir.net

ورسولَهُ، ويحبُه الله ورسولُهُ)، واته: بەیانی ئالاّیەکە دەدەمەدەست کەسێك خواو پێغەمبەری خوای خۆش دەوێنو، ئەوانیش خۆشیان دەوێ.

عومەری کوڕی خەططاب خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ هیچ کات حەزم لە ئیمارەتو بەرپرسییەتی نەبووە، ئەو ڕۆژە نەبێ، سەری خۆم بەرز کرد بۆ ئەوەی پێغەمبەر ﷺ بمبینێ (واتە: لەبەر ئەوەی فەرمووبووی: ئالاّیەکە دەدەمە دەست کەسێك خواو پێغەمبەری خوای خۆش دەوێن و، ئەوانیش خۆشیان دەوێ، ویستم: ئەو شایەدییەی پێغەمبەر ﷺ من بگرێتەوە، کە هەر واش بووە، بەلاّم پێی خۆش بووە، لە سەردەمی موبارەکی پێغەمبەر ﷺ ئەوەی وەك مۆرێك پێوە بێ) بەلاّم پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: عەلی کوڕی ئەبو طالیب لەکوێ یە؟ گوتیان: چاوی دێشێ، بانگی کردو، دوعایەکی بۆ خوێند، فووی موبارەکی خۆی لەچاوی دا، چاوی چاك بووەوەو ئالاّیەکەی تەسلیم کرد، پێغەمبەر فەرمووی: بڕۆو ئاوڕ مەدەوە، عەلی (خوا لێی ڕازی بێ) بێ ئەوەی ئاوڕبداتەوە ڕۆییشت، تاکو فەرمانەکەی پێغەمبەر ﷺ چاك جێ بەجێ بکا، لە حاڵێك دا ڕووی لەولابوو، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ لەسەرچی لەدژیان بجەنگم؟! ئەویش فەرمووی: بانگیان دەکەی بۆ ئەوەی کە تەنیا خوا

www.alibapir.net

بپەرستن‌و خوا بەیەك بگرن‌و، شایەدیی بدەن كە موحەممەد پێغەمبەری خوایە.

كەواتە: پێغەمبەر ﷺ كە سەرۆكی دەوڵەتیش بووە، ئەوەتا جەنگ‌و جیهادێك كە هاتۆتە پێش، لە گەرمەی جەنگ‌و جیهاد دا، فەرموویەتی: بانگەواز بكە! دوایی پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (لأنْ يهْدِيَ اللّه بِكَ رجُلًا واحِدًا خَيْرٌ لَكَ من حُمْرِ النعم)، واتە: ئەگەرخوا بەهۆی تۆوە: پیاوێك لەوانە هیدایەت بدات، بۆ تۆ باشترە لە حوشتری سپی، [(حُمر) كۆی: (أُحمر) (حمراء)ە، بە مانای سوور دێ، بەڵام مەبەستیان پێی وشتری سپییە، ئەو كات وشتری سپییماڵێكی بەنرخ بووە]، واتە: بۆتۆ چاكترە لە شتێك كە زۆرت خۆش بوێ.

<u>دووەم</u>: دەپرسین: ئایا بەبێ سیاسەت‌و لێزانیی‌و وردەكاریی، بانگەواز دەكرێ بۆ لای خوا؟! بانگەوازكار ئەگەر سیاسی نەبێ، هۆشیار نەبێ‌و، كۆمەڵگای خۆی نەناسێ، خێرو شەڕی خۆی لێك نەكاتەوە، ئایا دەتوانێ بانگەوازێكی ڕاست‌و دروست بكا؟ ئایا دەتوانێ بەپێی ئەوە كە پێویست دەكا لە كۆمەڵگاكەی دا، قسە بكات‌و، بۆ ئەوە بانگیان بكات كە ئەوان پێویستییان پێیەتی، نەك بۆ ئەوەی كە خۆی پێی خۆشە؟! بە تەئكید بانگەوازیش بەبێ سیاسەت‌و لێزانیی‌و هۆشیاریی ناكرێ.

www.alibapir.net

سێیەم: لە ڕاستییدا سیاسەتێك كە سەرەنجامەكەی نەبێتە هۆی بانگكردنی خەڵك بۆ لای خواو، تێگەیاندن و پێگەیاندنیان و لەخوا نیزیك خستنەوەیان و ڕێك و ڕاست كردنیان، مانای وایە ئامرازێكی بێ ئامانجە!

چوارەم: هەروەها بانگەوازكاری ناسیاسیی، بە ئاسانیی فریو دەدرێ، هەروەك سیاسەتی بێ بانگەوازیش، لەوانەیە بەئاسانیی كاری تێبكرێ، بەباری دنیاویستیی و بە لاڕێدا بردن و كۆنترۆڵكردن دا !

بۆیە براو خوشكانی خۆشەویست! ئەگەر تەماشای پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) بكەین، ئەوەی كە ئێستا باوە كە بانگەوازو سیاسەت لێك جیابن، ئێمە لە پەیامی پێغەمبەراندا شتی وا نابینین، بەڵكو پێغەمبەران (علیهم السلام) خەڵكیان بانگ كردوە بۆ خواپەرستیی: ﴿ يَـٰقَوْمِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَـٰهٍ غَيْرُهُۥٓ ﴾ (الأعراف – ٥٩ ، ٦٥، ٧٣، ٨٥) ئەم ڕستەیە بەپێی ڕیزبەندیی ژمارەی ئایەتەكان، لەسەر زمانی هەركام لە: نووح و هوودو صالح و شوعەیب (علیهم السلام)، هاتوە.

ئنجا خەڵك بانگكردن بۆ ئەوەی كە بەتەنیا خوا بپەرسترێ، هەندێك كەس وا دەزانن: ئەوە بەس (بانگەواز)ە، بەلام

www.alibapir.net

لەڕاستییدا ئەوە كرۆكو كاكڵی سیاسەتە، سیاسەتی ئیسلامیی، كاكڵەكەیو كرۆكەكەیو بناغەكەی، بریتییە لە تەنیا خواپەرستیی، سیاسەتی نا ئیسلامیی، بریتییە لە شیرك و پەرستنی غەیری خوا، ئەو فیرعەونو قارۆونو نەمروودو تاغووتانە، بۆیە بە پێغەمبەران قەڵس بوون، چونكە پێغەمبەران (عیلهم السلام) ویستوویانە: ئەو خەڵكە لە چنگی ئەو فیرعەونانە دەربێنن و، بیانكەنە بەندەی خوا، ئەوانیش گوتوویانە: نەخێر دەبێ هەر لەبن دەستی ئێمەدا بن، كۆیلەی ئێمەبن، كەواتە: تەوحیدێك كە بناغەو كاكڵو جەوهەری پەیامی پێغەمبەرانە (علیهم السلام)، بناغەی حوكمڕانییو سیاسەتی ڕەشیدە.

بۆیە من قەناعەتم وایە: مەسەلەی لێك جیاكردنەوەی بانگەوازو سیاسەت، بە یەكجارەكییو بە ڕەهایی، شتێكی نەگونجاوە، دەشزانم كە لە مەغریب وایان كردوەو ، لە عێراق كاتی خۆی (الإخوان المسلمون) حیزبی ئیسلامییان هەبوو وەك واجیهەی سیاسییو، ڕێكخستن (تنظیم)یشیان هەبوو، هەروەها كاتی خۆی لە ساڵی (١٩٩٦)دا، چووم بۆ ئوردن: (حزب جبهة العمل الإسلامي) هەبوو، ڕێكخستنی (الإخوان المسلمون)یشیان هەبوو، دیسان لە یەمەنیش (التجمع الیمني للإصلاح)، وەك واجهەی سیاسیی،

www.alibapir.net

هەبوو، تەنزیمی ئیخوانیشیان هەر هەبووە...هتد، بەلاّم مەرج نیە ئەوانە لەسەر بناغەی لێك جیاکردنەوەی سیاسەتو بانگەواز بووبێ، چونکە پێم وایە هەم حیزبەکەش بانگەوازی کردوەو، سیاسەتیشی کردوەو، هەم ڕێکخستنەکەش، هەردوو لای کردوون!

لە یەك حالّەتدا پێم وایە ئەوە ڕێی تێ دەچێ، ئەویش ئەوەیە، کە لەسەر بناغەی پسپۆڕیی، بگوترێ: با ئەو کۆمەڵە براو خوشکە، کاری سیاسیی بکەنو، با ئەو کۆمەڵەش، کارێکی دیکە بکەنو ...هتد، بەلاّم بەومەرجە کە ئەوە هەمووی لەسەر بناغەی ڕاوێژ بێو، لەسەر بناغەی دابەشکردنی کارەکان بێ، نەك لەسەر بناغەی لێك جیاکردنەوەی کارەکان و دروستکردنی دو کۆمەڵ و حیزبی جیاواز.

چونکە سەرەنجام لایەنە سیاسییەکان خەڵكو جەماوەرو کۆمەڵگا، وەختێك دەبینن، لەلایەکەوە تۆ ڕێکخستنێکت هەیەو، لەلایەکی دیکەشەوە واجهەیەکی سیاسییت هەیە، ئنجا تەماشا دەکەن، ئەو واجیهە سیاسییە لەبەردەستی ئەو ڕێکخستنە دایە، خەڵك بێ متمانە دەبێ! لە میسر یەکێ لە گرفتەکان ئەوەبوو، دەیانگوت: (دکتور محمد مرسي) ناتوانێ لە قسەی (محمد بدیع) دەربچێ، ئایا سەرۆك کۆمار کێ یە؟ بۆیە پێم وایە ئەوە

www.alibapir.net

حاڵەتێکی دووفلیقانەیی (إزدواجیة) دروست دەکات‌و، ڕاست ئەوەیە کە لەسەر بناغەی پسپۆڕیی‌و شارەزایی، کارەکان دابەش بکرێن، بەڵام بە خەڵك نەگوترێ: حیزب‌و ڕێکخستن لێك جیان، چونکە لێك جیا نین‌و، ناشگونجێ لێك جیا بن.

هەڵبەتە ناڵێم: ئەگەر واشبکرێ ناشەرعییە، بەڵام پێم وایە کە چاك ئامانج ناپێکێ‌و، نیشانەی پرسیاریش دروست دەکات، هەم لەسەر حزبەکەش‌و، هەم لەسەر ئەوەش کە بەحیساب کاری فیکریی‌و پەروەردەیی‌و بانگەوازیی دەکا. هەموویان نیشانەی پرسیاریان دەچێتە سەرێ، ئنجا کە تەماشای پێغەمبەرانیش (علیهم السلام) دەکەین، دەبینین لەنێو کاری بانگەوازدا، کاری سیاسییان کردوەو، لە نێو کاری سیاسییدا، بانگەوازیان کردوەو، کارەکەیان هەمووی تێکهەڵکێش بووە، هەروەها کە تەماشای قورئانیش دەکەین، هەر وای دەبینین، شتەکان تێك هەڵکێشن، بەڵام دەگونجێ لەسەر بناغەی پسپۆڕیی، کاروبار دابەش بکرێ، چونکە لەسەردەمی پێغەمبەریش دا ﷺ هەندێك لە هاوەڵان (خوا لێیان ڕازی بێ)، پێغەمبەری خوا ﷺ لەڕووی کاری عەسکەرییەوە، زیاتر بواری پێداون‌و، هانی داون، بۆ وێنە: (خالیدی کوڕی وەلید)، هەروەها هەندێکیان لەڕووی کاری سیاسیی‌و دیبلوماسییەوە، ڕۆڵیان گێڕاوەو، هەندێکیان لەڕووی

www.alibapir.net

کاری عیلمیی‌و فیکرییه‌وەو، هەندێکیان لەڕووی قوڕئان خوێندن‌و شارەزایی لە قوڕئانەوەو، هەندێکی دیکەیان لەڕووی لەبەرکردنی فەرموودەکانەوە، وەك (أبو هريرة)، خوا لە هەموویان ڕازی بێ، بەڵام بەو جۆرەنا کە ببنە گرووپ‌و حیزبی جیاجیا!

ameer.maktab@yahoo.com
 /AliBapir  /AliBapir  /MediaAmeerOffice
www.alibapir.net

## مەسەلەی دووەم: بەکارهێنانی هێز بۆ پاکسازیی‌و چاکسازیی لە کۆمەڵگادا، شتێکی ناڕەوایە:

بەڕێزان! لێتان تێکەڵ نەبێ! دەڵێم: بۆ پاکسازیی‌و چاکسازیی کردن لە کۆمەڵگادا، بەکارهێنانی هێز، شتێکی ناڕەوایە، چونکە کاتێك لایەنێکی ئیسلامیی لە کۆمەڵگایەکدا خۆی دەبینێتەوە، کە لە پابەندیی بە ئیسلامەوە دا کەم‌و کوڕیی هەیە، چوار (٤) ئەگەری لەپێشن، وەك جاری دیکەش باسمان کردوە:

١) یان ئەوەتا بە هێز بەگژ ئەو کۆمەڵگایەدا بچێتەوە، کە ئەو بیرۆکەیە زۆربەی ئەو ڕێکخراوانەی، ئێمە پێمان وایە تێپەڕێنەرن، تەبەنییان کردوە، کە ئەوان بەخۆیان دەڵێن: جیهادیی، بەڵام پێم وایە تێپەڕێنەرن، چونکە ئەو بیرۆکەیان تەبەنییان کردوە، کە کۆمەڵگاکانی خۆیان، بەزەبری هێز بگۆڕن.

www.alibapir.net

٢) ئەوەیە کە تەسلیمی ئەو کۆمەڵگایە بن‌و، مێشیْ لە ئاو نەکەن و، هەرچی ئەو کۆمەڵگایەو دەسەڵاتەکەی گوتی، بڵێن: بەڵێ!

٣) ئەوەیە کە ڕاکەن‌و، ئەو کۆمەڵگایە بەجێ بهێڵن، سەری خۆیان هەڵگرن‌و بڕۆن، وەك هاوەڵانی ئەشکەوت.

٤) ئەوەیە، کە نە تەسلیمی بن‌و، نە تێیدا بتوێنەوەو، نە بەگژیشیدا بچنەوەو، نە لەبەریشی ڕاکەن، بەڵکو مودارای لەگەڵدا بکەن.

ئنجا ئەگەر تەماشای سیرەو ژیانی پێغەمبەران بکەین، چ پێغەمبەری خاتەم محمد ﷺ، چ پێغەمبەرانی دیکە (علیهم الصلاة والسلام)، هی چوارەمیان تەبەننیی کردوەو، بەهیچ جۆرێك بەگژ کۆمەڵگادا نەچوونەوە، هیچ پێغەمبەرێکم نەبینیوە -وەك لە قورئان دا بۆمان باسکراوە- لە (ئادەم)ەوە تا خاتەم، کە هەڕەشەی لە کۆمەڵگاکەی خۆی کردبێ، نەك هەر دەستپێشخەریی هەڕەشەکردنیان نەکردوە، بەڵکو لەبەرامبەر هەڕەشەشدا هەڕەشەیان نەکردوە، وەك خوای پەروەردگار بەسەرهاتیانمان بۆ دەگێڕێتەوە:

١- ئەوەتا نووح (علیه السلام) گەلەکەی پێی دەڵێن: ﴿لَئِن لَّمْ تَنتَهِ يَٰنُوحُ لَتَكُونَنَّ مِنَ ٱلْمَرْجُومِينَ ۝١١٦﴾ (الشعراء: ١١٦)، واتە:

www.alibapir.net

بەدڵنیایی ئەی نووح! ئەگەر وازنەهێنی لە بەردبارانکراوان دەبی.

٢- هەروەها گەلی ئیبراهیم (علیه السلام) هەڕەشەی سووتاندنی لێدەکەن: ﴿ قَالُوا۟ حَرِّقُوهُ وَٱنصُرُوٓا۟ ءَالِهَتَكُمْ إِن كُنتُمْ فَٰعِلِينَ ﴿٦٨﴾ ﴾ (الأنبياء: ٦٨ ). واتە: گوتیان: بیسووتێنن و پەرستراوەکانتان سەربخەن، ئەگەر دەتانەوێ کارێك بکەن.

٣- هەروەها گەلی شوعەیب (علیه السلام) پێی دەڵێن: ﴿ ۞ لَنُخْرِجَنَّكَ يَٰشُعَيْبُ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَعَكَ مِن قَرْيَتِنَآ أَوْ لَتَعُودُنَّ فِى مِلَّتِنَا ﴾ (الأعراف: ٨٨ ). واتە: ئەی شوعەیب! خۆتو ئەوانەی بڕوایان لەگەڵت هێناوە، شاربەدەرتان دەکەین لە شارەکەمان، یان دەگەڕێنەوە نێو ئایینەکەمان!

٤- هەروەها پێغەمبەرانی دیکەش، وەك لە سووڕەتی (إبراهیم)دا خوای زانا و توانا هەموو پێغەمبەران (علیه السلام) پێکەوە لەسەر یەك ئاست کۆدەکاتەوەو، لەبەرامبەریشیاندا نەیارەکانیان، پێم خۆشە زۆر سەرنجی ئەو دیالۆگە بدەن:

ameer.maktab@yahoo.com
 /AliBapir  /AliBapir  /MediaAmeerOffice
www.alibapir.net

www.alibapir.net

﴿ أَلَمۡ يَأۡتِكُمۡ نَبَؤُاْ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِكُمۡ قَوۡمِ نُوحٖ وَعَادٖ وَثَمُودَۛ
وَٱلَّذِينَ مِنۢ بَعۡدِهِمۡۛ لَا يَعۡلَمُهُمۡ إِلَّا ٱللَّهُۚ جَآءَتۡهُمۡ رُسُلُهُم
بِٱلۡبَيِّنَٰتِ فَرَدُّوٓاْ أَيۡدِيَهُمۡ فِيٓ أَفۡوَٰهِهِمۡ وَقَالُوٓاْ إِنَّا كَفَرۡنَا بِمَآ أُرۡسِلۡتُم
بِهِۦ وَإِنَّا لَفِي شَكّٖ مِّمَّا تَدۡعُونَنَآ إِلَيۡهِ مُرِيبٖ ﴿٩﴾ ۞ قَالَتۡ رُسُلُهُمۡ
أَفِي ٱللَّهِ شَكّٞ فَاطِرِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ يَدۡعُوكُمۡ لِيَغۡفِرَ لَكُم مِّن
ذُنُوبِكُمۡ وَيُؤَخِّرَكُمۡ إِلَىٰٓ أَجَلٖ مُّسَمّٗىۚ قَالُوٓاْ إِنۡ أَنتُمۡ إِلَّا بَشَرٞ
مِّثۡلُنَا تُرِيدُونَ أَن تَصُدُّونَا عَمَّا كَانَ يَعۡبُدُ ءَابَآؤُنَا فَأۡتُونَا بِسُلۡطَٰنٖ
مُّبِينٖ ﴿١٠﴾ قَالَتۡ لَهُمۡ رُسُلُهُمۡ إِن نَّحۡنُ إِلَّا بَشَرٞ مِّثۡلُكُمۡ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ
يَمُنُّ عَلَىٰ مَن يَشَآءُ مِنۡ عِبَادِهِۦۖ وَمَا كَانَ لَنَآ أَن نَّأۡتِيَكُم بِسُلۡطَٰنٍ
إِلَّا بِإِذۡنِ ٱللَّهِۚ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلۡيَتَوَكَّلِ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ﴿١١﴾ وَمَا لَنَآ أَلَّا
نَتَوَكَّلَ عَلَى ٱللَّهِ وَقَدۡ هَدَىٰنَا سُبُلَنَاۚ وَلَنَصۡبِرَنَّ عَلَىٰ مَآ ءَاذَيۡتُمُونَاۚ
وَعَلَى ٱللَّهِ فَلۡيَتَوَكَّلِ ٱلۡمُتَوَكِّلُونَ ﴿١٢﴾ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لِرُسُلِهِمۡ
لَنُخۡرِجَنَّكُم مِّنۡ أَرۡضِنَآ أَوۡ لَتَعُودُنَّ فِي مِلَّتِنَاۖ فَأَوۡحَىٰٓ إِلَيۡهِمۡ رَبُّهُمۡ
لَنُهۡلِكَنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٣﴾ وَلَنُسۡكِنَنَّكُمُ ٱلۡأَرۡضَ مِنۢ بَعۡدِهِمۡۚ
ذَٰلِكَ لِمَنۡ خَافَ مَقَامِي وَخَافَ وَعِيدِ ﴿١٤﴾ وَٱسۡتَفۡتَحُواْ وَخَابَ

www.alibapir.net

كُلُّ جَبَّارٍ عَنِيدٍ ﴿١٥﴾ مِّن وَرَآئِهِۦ جَهَنَّمُ وَيُسْقَىٰ مِن مَّآءٍ صَدِيدٍ ﴿١٦﴾ يَتَجَرَّعُهُۥ وَلَا يَكَادُ يُسِيغُهُۥ وَيَأْتِيهِ ٱلْمَوْتُ مِن كُلِّ مَكَانٍ وَمَا هُوَ بِمَيِّتٍ ۖ وَمِن وَرَآئِهِۦ عَذَابٌ غَلِيظٌ ﴿١٧﴾ ﴾ (إبراهيم: ٩ – ١٧)

واتە: ئایا هەواڵی ئەوانەی پێش خۆتانتان پێ نەگەیشتوە! گەلی نووحو عادو ثەموودو ئەوانەی دوای وانیش، پێغەمبەرەکانیان بە بەڵگە ڕۆشنەکانەوە هاتنە لایان، کەچی ئەوان دەستیان بەزاریانەوەنا – تاکو بێدەنگیان بکەن – پێشیان گوتن: ئێمە بەوەی پێی ڕەوانەکراون، بێبڕواین و لەدوودڵییەکی خەست داین، بەرانبەر بەوەی ئێمەی بۆ بانگ دەکەن.

پێغەمبەران گوتیان: ئایا دوودڵیی هەیە لەخوای پەیداکەری ئاسمانەکان و زەویدا؟

بانگتان دەکات تاکو لە گوناهەکانتان بتانبووریّ و، بۆ کاتێکی ناوبراو دواتان بخات – نەتانفەوتێنیّ - !! (گەلەکافرەکانیان) گوتیان: ئێوەش هەر مرۆڤێکن وەك ئێمە، دەتانەویّ لەوەی باب و باپیرانمان لەسەری بوون، لامان بدەن (ئەگەر ڕاست دەکەن) بەڵگەیەکی ڕوونمان بۆ بێنن، پێغەمبەرانیان پێیان گوتن: بەدڵنیایی ئێمەش مرۆڤی وەك ئێوەین، بەڵام خوا چاکە دەکات

www.alibapir.net

لەگەڵ هەر کام لە بەندەکانی دا کە بیەوێ (:بیکاتە پێغەمبەر) بۆشمان نیە بەبێ مۆڵەتی خوا، هیچ نیشانەو بەڵگەیەکتان بۆ بێنن‌و، با بڕواودارانیش تەنیا پشت بەخوا ببەستن.

ئنجا بۆچی پشت بەخوا نەبەستین! کە ڕێبازەکانمانی (بۆ دینداریی‌و دنیاداریی) پێشان داوین! بەدڵنیاییش هەرچەندە ئازارمان بدەن، هەر خۆڕاگردەبین (لەبەر ڕاستە شەقامی خوا)و، پشت بەستووانیش با تەنیا پشتیان بەخوا قایم بێ.

ئنجا بێبڕوایەکان بە پێغەمبەرانی خۆیانیان گوت: یان لەشارو وڵاتمان دەرتان دەکەین، یان دەگەڕێتەوە سەر ڕێبازەکەمان!

پەروەردگاریان سروشی بۆ کردن: بێگومان ستەمکاران دەفەوتێنین‌و، ئێوەش لەدوای وان لەسەرزەمین نیشتەجێ دەکەین.

ئەو موژدەیەش بۆ کەسانێکە کە تەنیا لە پایەی من‌و لە هەڕەشەی من بترسێن.

ئیدی سەرەنجام پێغەمبەران داوای هاوکاریی خوایان کردو، هەر خۆسەپێنێکی ملهوڕ بێمرادبوو. دۆزەخ لە پشتەوەیەتی‌و، لە ئاوێکی کێم‌و زووخاوی پێ دەنۆشرێ. زۆر بە زەحمەت قوم قوم قوتی دەدات‌و، نیزیک نیە (بەئاسانیی) بۆی قوت بچێ‌و، لە

www.alibapir.net

هـەموو لایەکـەوە مردنـی بـۆ دێو، نـاشمرێو، لـە پشـتیەوە ئازارێکی بێڕەزا هەیە.

مەبەستم ئەوەبوو کە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام):

١) نەك هەڕەشەکار نـەبوونو، زەبـرو زەنگیـان بـەکار نـەهێناوەو هەڕەشەشـیان پـێ نـەکردوە، بگـرە لـە بەرانبـەر هەڕەشـەش دا هەڕەشەیان نەکردوە.

٢) تەسلیمی واقیعیش نەبوون: ﴿وَلَنَصْبِرَنَّ عَلَىٰ مَآ ءَاذَيْتُمُونَاۚ﴾، بەڵکو پشوودرێژانەو خۆڕاگرانە بەردەوام بوون، چونکە ﴿وَلَنَصْبِرَنَّ عَلَىٰ مَآ ءَاذَيْتُمُونَاۚ﴾ یانی: تەسلیمتان نابین.

٣) پاشان ڕاشیان نـەکردوەو، وڵاتیشیان بـەجێ نەهێشتوە، بـەڵێ دوژمنانیـان گوتوویانـە: دەربـەدەرتان دەکـەین، شـاربەدەرتان دەکـەین، بـەڵام هـیچ پێغەمبـەرێك بۆخـۆی وڵاتـی بـەجێ نەهێشـتوە، مەگـەر دەرکرابـێ، پێغەمبـەری خاتـەم ﷺ کـاتێ دەردەکـرێ، ئـاوڕ دەداتـەوە لەشـاری مەککـەو، دەفـەرموێ: (مـا أطيبـك مـن بلـد و أحبـك إلـيّ، لـولا أنّ قـومي أخْرجُـوني منـك لـمْ أسـكُن غـيرك) رواه الترمـذي: ٣٩٢٦، و الألبـاني في صـحيح (المشكاة): ٢٧٢٤. واتـە: بـەخوا تـۆ خۆشەویسـترین سـەرزەمینی

www.alibapir.net

خوای لامو، ئەگەر قەومەکەت دەریان نەکردبام، لەغەیری تۆدا نیشتەجێ نەدەبووم، (بەڵام بەناچاریی دەڕوم).

کەواتە: ئایا پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) چییان کردوە:؟!

٤) ئەومیان کردوە کە ئایەتەکە دەفەرموێ: ﴿ وَلَنَصۡبِرَنَّ عَلَىٰ مَآ ءَاذَيۡتُمُونَاۚ ﴾، یانی: هەمان شت کە پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەفەرموێ: (المؤمن الذي يخالط الناس ويصبر على أذاهم خير من الذي لا يخالط الناس ولا يصبر على أذاهم)، رواه البخاري في (الأدب المفرد): ٣٨٨، و أحمد في المسند (٥٠٢٢) و ابن ماجه بإسناد حسن (صحيح ابن ماجه: ٣٢٧٣) و الترمذي (صحيح الجامع: ٦٦٥١). و الألباني في (السلسلة الصحيحة) (٦٥٢/٢). واتە: ئەو بڕوادارەی لەگەڵ خەڵك تێکەڵ دەبێ، مامەڵەیان لەگەڵ دەکاو لەنێویاندا دەمێنێتەوەو صەبر دەگرێ لەسەر ئازارەکەیان، لەسەر نارەحەتییەکانیان، باشترەو چاکترە لای خوا لەوەی کە تێکەڵیان نابێو، صەبریش ناگرێ لەگەڵیاندا.

بۆیە بەکارهێنانی هێز بۆ گۆڕانکاریی لە کۆمەڵگادا، پێچەوانەی ڕێو شوێنی پێغەمبەرانە (علیهم الصلاة والسلام) بەگشتییو، پێچەوانەی ڕێو شوێنی پێغەمبەری خاتەمە ﷺ بەتایبەت، وەك

www.alibapir.net

له سوورەتی (النساء)دا خوا ی كاربەجیٚ دەفەرمویٚ: ﴿ أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ قِيلَ لَهُمْ كُفُّوٓاْ أَيْدِيَكُمْ وَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ ﴾ النساء: ٧٧ ، واتە: ئایا سەرنجی ئەوانەت نەداوە كە پیٚیان گوترا: دەستی خۆتان بگیٚڕنەوە (بپاریٚزن)و، نویٚژ بەرپا بكەنو، زەكات بدەن... پیٚغەمبەریش ﷺ لە قۆناغی مەككەدا هەر دەیفەرموو: (لن نؤمر بالقتال)[1]، فەرمانمان پیٚ نەكراوە بجەنگین.

لیٚرەدا پرسیاریٚك دەكریٚ: ئایا چەك و هیٚز، شویٚنی لە ئیعرابی ئیسلامدا چییەو كەنگیٚیە؟! دەلیٚین: لەراستیدا هیٚزو چەك دەولەتی ئیسلامیی بەكاری دیٚنیٚ، ئەویش بۆ پاراستنی خۆیو هاوولاتیانییو سنوورەكانی، نەك بۆ فەرزكردنو سەپاندنی ئیسلام.

بەلیٚ دەولەت هیٚز بەكاردیٚنیٚ لە حالەتی ئاساییدا، بەلام ئایا هیچ كەسیٚكی دیكە بەكاری ناهیٚنیٚ؟ با، كەسانیٚكیش كە زولمیان لیٚ دەكریٚ، زولمی نەتەوەیی بیٚ، زولمی دینیی بیٚ، زولمی سیاسیی بیٚ، ستەمی ئابووریی، ستەمی كۆمەلایەتیی، هەر جۆرە زولمیٚك بیٚو، هیچ دەرفەتیان نامیٚنیٚ، ئەوانەش بۆیان هەیە بەرگریی لەخۆیان بكەنو، بەرپەچی دوژمنانو ستەمكاران

[1] السيرة النبوية لابن هشام، ج٢ ص٢٣١.

www.alibapir.net

بدەنەوە، وەك خوای دادگەر دەفەرموێ: ﴿ أُذِنَ لِلَّذِينَ يُقَـٰتَلُونَ بِأَنَّهُمْ ظُلِمُوا۟ ۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ نَصْرِهِمْ لَقَدِيرٌ ﴿٣٩﴾ ﴾ (الحج: ٣٩)، واتە: ئەوانەی شەڕیان لەدژ دەكرێ، چونكە ستەمیان لێدەكرێ، مۆڵەت دران – بەگریی لەخۆیان بكەن –مسۆگەر خواش لەسەر سەرخستنیان توانایە.

ئەم ئایەتەش یەكەم ئایەتە دابەزی بێ، دەربارەی جەنگو جیهادو، هەر بەڕێوەش دابەزیوە، كاتێك پێغەمبەرﷺ كۆچی كرد بۆ مەدینە، هەندێكیش دەڵێن: لە مەدینەدا دابەزیوە، بەلام وا پێ دەچێ بەڕێوەدا دابەزیبێ، گرنگ ئەوەیە كە مسوڵمانانێكی وەك: خەڵكی فەڵەستین، میانمار (ڕۆهینگا)، شیشان، كشمیر، گەلی كورد،... هتد، وەختێ ستەمیان لێ دەكرێو دەوڵەتیان نیە، بەڵكو دەوڵەت ستەمیان لێ دەكا، كاتێك خەڵك دەچەوسێندرێتەوە، دەرفەتی تێدا هەیە، بۆ جەنگو جیهادو بەرگریی لەخۆكردن.

بەلام گرنگ ئەوەیە بزانرێ: بۆ ئەوەی كۆمەڵگایەك پاكسازییو چاكسازی تێدا بكرێ، یان قەوارەی سیاسیی ئیسلامیی دروست بكرێ، ئا ئەوە لەڕێی بەكارهێنانی هێزەوە ناكرێ، ئنجا لەكاتی ستەمو دەستدرێژییش دا، ئەو كاتەش دەبێ هەڵسەنگاندن (موازنــة) بكرێ لەنێوان سوودەكان (منافع) و زیانەكان

www.alibapir.net

(مضار)داو، دەبێ سەرکردایەتییەکی سەرڕاست، ئەو بڕیارە بدا، هەر ئەوەشە کە پێغەمبەر ﷺ لە هەندێ لە فەرمایشتەکانی دا ئاماژەی پێ دەکا، بۆ وێنە: (لن يبرح هذا الدين قائماً، يقاتل عليه عصابة من المسلمين، حتى تقوم ساعة) (رواه مسلم): ١٩٢٢، کە بە ڕیوایەتی دیکەش هەر هاتوە.

واتە: ئەم ئایینە بەرپا دەبێو، بەردەوام دەبێ، تاکو ئاخیرزەمان، کۆمەڵێك لە مسوڵمانان لەپێناوی دا دەجەنگن.

کە پێم وایە ئەوە ئاماژەیە بەوانەی، کە کاتێك هەموو ڕێگاکانیان لێ دەگیرێن‌و، هیچ دەرفەتیان نامێنێ، فیداکاریی دەکەن، بۆ وێنە: مسوڵمانانی فەڵەستین جگە لەوەی کە لەبەرامبەری ئەو توندوتیژییەی جوولەکەدا، جار جار چالاکییەك بکەن، هیچی دیکەیان بەدەستەوە نیە، ئەدی خۆیان بەدەستەوە بدەن؟! بەڵێ ئەگەر دەوڵەتێك هەبێ، دەبێ دەوڵەت جەنگ‌و جیهاد تەبەننیی بکات، بەڵام کاتێك مسوڵمانانێك لە شوێنێك گرفتار دەبن‌و، دەوڵەتێك نیە بیانپارێزێ‌و، بەرامبەرەکانیشیان هێزیان لەدژ بەکاردێنن، ئەوە دیارە عەقڵ‌و شەرع ڕێگایان پێ دەدا، کە ئەوانیش هێز بەکاربێنن‌و، ئەو فەرمایشتانەی پێغەمبەر ﷺ ئاماژە بەوە دەکەن، بەڵام حاڵەتی ئاسایی دەوڵەتی ئیسلامیی ئەوەیە، کە دەوڵەت ئیعلانی جەنگ‌و

www.alibapir.net

جیهاد دەكا، دەوڵەت هێز بەكاردێنێ، بۆ پاراستنی هاووڵاتییانیو پاراستنی سنوورەكانی خۆی.

بۆیەش دەڵێم: بەكارهێنانی هێز بۆ گۆڕانكاریی لە كۆمەڵگادا، یان دروستكردنی قەوارەی سیاسیی، لە ئیسلامدا دروست نیە، چونكە ئەوە سەرەنجام سەردەكێشێ بۆ زۆر لێكردنی خەڵكو، ناچاركردنی خەڵك، كە دیارە ناچاركردنی خەڵكیش لەسەر دینداریی، شتێكی ڕەتكراوەیە، لەو بارەوەش بەڵگە زۆرن، بۆ نموونە:

١- ﴿ لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِۖ ﴾ (البقرة: ٢٥٦)، واتە: زۆرلێكردن لە ئایین دا نیە.

٢- ﴿ وَقُلِ ٱلۡحَقُّ مِن رَّبِّكُمۡۖ فَمَن شَآءَ فَلۡيُؤۡمِن وَمَن شَآءَ فَلۡيَكۡفُرۡۚ ﴾( الكهف: ٢٩) واتە: بڵێ هەق لە پەروەردگارتانەوەیە، ئنجا كێ دەیەوێ بابڕوا بێنیو كێش دەیەوێ، با بێبڕوا بێ.

٣- هەروەها تۆبزیی لێ كردن، خەڵك دەكاتە مونافیقو، نایكاتە مسوڵمان.

٤- هەروەها دینداریيو مسوڵمانەتیی سەروكاری لەگەڵ عەقڵو دڵی مرۆڤدا هەیە، نەك لەگەڵ ڕواڵەتیدا، كەسێك نوێژێش

www.alibapir.net

بکات، ئەگەر بۆ خوای نەکات، خوا لێی وەرناگرێ، بگرە سزاشی دەدا، هەروەها ڕۆژوو بگرێو، هەرشتێکی بیکات، مادام لە دڵەوە بۆ خوای نەبێ، بەکەڵك نایەت، بەڵێ ئیسلام پێشێ سەروکاری لەگەڵ دڵو دەروون دا هەیە، بۆیەش پێغەمبەران (علیهم السلام) هەمیشە هەوڵیانداوە گۆڕانکاریی (تغییر) لە ڕێی هۆشیارکردنەوەی عەقڵی خەڵكو، بێدارکردنەوەی دڵو دەروونیانەوە بکەن.

ameer.maktab@yahoo.com
/AliBapir /AliBapir /MediaAmeerOffice
www.alibapir.net

**مەسەلەی سێیەم: قۆناغی بانگەوازو قۆناغی دەوڵەت، حوکمیان جیایە:**

زۆرجار جموجۆڵە ئیسلامییەکانو پرۆژەکانی کاری ئیسلامیی، لە ئەنجامی چاك تێ نەگەیشتنی ئەم مەسەلەیەدا: لێك جیانەکردنەوەی قۆناغی بانگەوازو قۆناغی دەوڵەوت، گیرۆدەی هەڵەو پەڵەو، پاشان باج دانی زۆر بوون، لێتان تێك نەچێ، سیاسەتو بانگەواز تێکەڵکێشن، بەڵام قۆناغی بانگەوازو، قۆناغی دەوڵەت لێك جیان.

قۆناغی بانگەواز، ئەو قۆناغەیە کە مسوڵمانان تێیدا دەسەڵاتیان نیە، کە لە سیرەی پێغەمبەردا ﷺ نموونە دەهێندرێتەوە بە

www.alibapir.net

قۆناغی مەککە، کە پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی لە مەککە، چەوسێندراوەو، بێ دەسەڵات بوون، هەڵبەتە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (صبراً آل یاسر، فإن موعدکم الجنة)[1]، واتە: ئەی بنەماڵەی یاسر خۆڕاگربن ژوانگەتان بەهەشتە. یان کە خوا فەرموویەتی:﴿ أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ قِيلَ لَهُمْ كُفُّوٓاْ أَيْدِيَكُمْ وَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ... ﴾ النساء:٧٧، دەیانتوانی شتێك هەر بکەن، بەڵام دەیانزانی کە زیانی لەقازانجی زیاتر دەبێ، هەروەها دەیانزانی مادام ئەو خەڵکە ئامادە نیە ئیسلام لە باوەش بگرێ، بەزۆر بەسەریاندا فەرز ناکرێ.

بەڵێ، قۆناغی بانگەواز، یانی: قۆناغی بێ دەسەڵاتیی و قۆناغی چەوسێندراوەیی، جیایە لە قۆناغی دەسترۆیشتوویەتی و دەستکراوەیی و، هەبوونی دەوڵەت و قەوارەی سیاسیی، بۆیەش دەبینن هەموو یاساکانی ئیسلام، ئەو یاسایانەی کە ئەندازەو چۆنییەتی و سنووریان بۆ دیاریی کراوە، بۆ وێنە: پایەکانی ئیسلام و، حەڵاڵ و حەرامەکان و، سزا شەرعییەکان هەموویان لە قۆناغی مەدینەدا فەرز بوون، بێگومان: لە قۆناغی مەککەش نوێژ هەبووە، بەیانیان دوو ڕکات و ئێواران دوو ڕکات، هەروەها ڕۆژوو هەبووە، بەڵام بە موتڵەقیی، دیسان ماڵ بەخشین هەبووە،

[1] السیرة النبویة لابن هشام، ج١ص ١٦٢، أخرجه الحاکم في مستدرکه: ٥٦٤٦، و الطبراني في الکبیر: ٧٦٩، و الأوسط: ١٥٠٨، و البیهقي في الشعب: ١٦٣.

www.alibapir.net

بەلام بە موتڵەقیی، هەروەها بە دەوری کەعبەدا تەوافیان کردوەو، جۆرە خواپەرستییەکانی دیکەش کەم‌و زۆر هەبوون، بەلام ئاوا بەو شێوەیە کە ئێستا ئێمە دەزانین: پێنج فەرزەی نوێژو[1]، ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان‌و، زەکاتو، حەج، ئنجا سزاو سنوورە شەرعییەکان، بە دڵنیاییەوە هەموویان لە مەدینە هاتوونە خوار، چونکە لە مەککە مسوڵمانان خاوەنی قەوارەو دەسەلاتو بوونێکی خۆیان نەبوون، تاکو ئەو سنوورو یاسایانەیان بۆ بێنە خوارو جێ بەجێ یان بکەن، خوای پەروەردگاریش بە تەئکید داوای شتێك لە کەسێك یان لە کۆمەڵێك ناکات، لە توانایاندا نەبێت: ﴿ لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا ﴾ البقرة: ٢٨٦.

لە سوورەتی (الحج)دا، خوای بەرزومەزن لەدوای ئەوەی یەکەمین ئایەت دەربارەی جەنگ‌و جیهاد دەنێرێتە خوارێ، وەك مۆڵەت پێدانی ئەهلی ئیمان، کە بەرگریی لە خۆیان بکەن، وەك ئامانجی جەنگ‌و جیهاد دەفەرموێ: ﴿ وَلَوْلَا دَفْعُ ٱللَّهِ ٱلنَّاسَ بَعْضَهُم بِبَعْضٍ لَّهُدِّمَتْ صَوَٰمِعُ وَبِيَعٌ وَصَلَوَٰتٌ وَمَسَٰجِدُ يُذْكَرُ فِيهَا ٱسْمُ

---

[1] پێنج نوێژە فەرزەکان لە شەوی میعراج دا فەرز کران، بڕوانە: السيرة النبوية لإبن هشام، ج٢ ص ٢١٠.

www.alibapir.net

ٱللَّهِ كَثِيرًاۗ وَلَيَنصُرَنَّ ٱللَّهُ مَن يَنصُرُهُۥٓۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَقَوِيٌّ عَزِيزٌ ﴿٤٠﴾ ٱلَّذِينَ إِن مَّكَّنَّٰهُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ أَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُاْ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَمَرُواْ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَنَهَوۡاْ عَنِ ٱلۡمُنكَرِۗ وَلِلَّهِ عَٰقِبَةُ ٱلۡأُمُورِ ﴿٤١﴾ ﴾ الحج، واته: ئەگەر بەهۆی ئەوەوە نەبووایە کە خوا هەندێك لە خەڵکی (ستەمکار)ی بە هەندێك لە خەڵکی (جەنگاوەرو فیداکار) بەرپەرچ دەداتەوە، بێگومان دێرەکان و کڵێساکان و کەنیشتەکان —ی جووان— و مزگەوتەکان، کە زۆر یادی خوایان تێدا دەکرێ، دەڕووخێنران. بەدڵنیایی کەسانێکیش (ئایینی) خوا سەربخەن، خوا سەریان دەخات، مسۆگەر خوا بەهێزی زاڵە. ئەوانەی کاتێك دەسترۆیشتوویان دەکەین لە زەوی دا: نوێژ بەرپا دەکەن و، زەکات دەدەن و، فەرمان بە پەسند دەکەن و، ڕێگریی لە ناپەسند دەکەن و، سەرەنجامی کارەکانیش تەنیا بۆ لای خوایە.

﴿ ٱلَّذِينَ إِن مَّكَّنَّٰهُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ ﴾، ئەوانەی کە دەسترۆیشتوومان کردن لە زەوی دا، [ (مَكنَهُ) (أعطاهُ مكاناً) ]، جێگیری کرد، چەسپاوی کرد، دەسەڵاتیی پێدا، (تمكين) واتە دەسترۆیشتوو کردن، کەواتە: مسوڵمانان پێش ئەوەی دەسترۆیشتوو بکرێن، لەسەریان پێویست نیە، ئیسلام و شەریعەتەکەی وەك سیستەمی حوکمڕانیی بەڕێوەبەرن، بەڵام ئەوەش مانای وانیە، وەك کاتی

www.alibapir.net

خۆی گرووپی: (التكفير والهجرة) له میسر بەهەڵەدا چووبوون‌و، پێیان وابوو: کە ئێمە دەبێ ڕێك قۆناغی مەککەو مەدینە دووبارە بکەینەوە! ئەوە وانیە، چونکە ئەحکامی ئیسلام هەموویان هاتوونەتە خوارو چەسپاون‌و، دەبێ مسوڵمانان هەرچی پێیان دەکرێ، جێ بەجێیان بکەن، بۆ وێنە: ئێمە ئێستا مولزەمین نوێژ بکەین، ڕۆژوو بگرین، زەکات بدەین، حەج بکەین... هتد، بەڵێ دەسەڵاتمان نیەو خاوەن قەوارەی سیاسیی نین، بەڵام مولزەمین بە حوکمە شەرعییەکانەوە، بەپێی توانای خۆمان، وەك خوای زاناو شارەزا فەرموویەتی: ﴿ فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ مَا ٱسۡتَطَعۡتُمۡ ﴾(التغابن: ١٦ )، واتە: بەپێی تواناتان پارێز لەخوا بکەن. بەڵام ئەو حاڵەی کە ئێستا تێیداین، جیایە لەوەی کاتێك کە دەسەڵاتمان دەبێ‌و دەستڕۆیشتوو دەبین، تەنانەت سەبارەت بە دروشمەکانیشەوە، ئێستا زۆر لە مزگەوتەکان مامەڵەی ناشایستی وایان لەگەڵدا دەکرێ، کە ئێمە بە دڵمان نیەو بە ستەم‌و لادانی دەزانین! هەروەها لە بوارەکانی: ئابووریی‌و ئەدەبە کۆمەڵایەتییەکان‌و، ئیدارەو سیاسەت دا، مونکەرەکان‌و ناشەرعیی زۆر دەکرێن‌و، بۆشمان ناگۆڕدرێن‌و کاتێ دەسەڵاتمان هەبێ، بە دڵنیاییەوە بەشێوەیەکی دیکە مامەڵە لەگەڵ ئەوانەدا

www.alibapir.net

دەكـەين، كەواتــە قۆنــاغی بانگـەواز لەگـەڵ قۆنــاغی هــەبوونی دەوڵەتو دەستڕۆیشتوویەتی، لێك جیانو حوكمەكانیان جیان.

**مەسەلەی چوارەم: ئافرەتو پیاو لە هەموو شتێكدا یەكسانن، جگە لەوەی جیاوازیی سروشتیان دەیخوازێ:**

لێرەدا مەبەستمان: كاری ئیسلامیی‌و دینـداریی‌و مسولْمانیەتییە بە گشتی، لـەوبارەوە شـتم زۆر نووسـیوە، بـۆ نموونـە: (ئـافرەتو خێزان لەسـایەی شـەریعەت دا) بـەڵام ئـەوەی مەبەسـتمە لێـرەدا ئەوەیە، كە ئێستا مسوڵمانان چونكە لە حاڵەتی بێ دەسـەڵاتیی‌و بــــەجێماویی‌و دواكەوتوویــــەتی دان، لــــەڕووی دنیادارییــــەوە، هەمیشە خۆیان لە حاڵەتی بەرگریی لـە خـۆكردن دا دەبیننـەوە! كاتی خۆی كە ئیسلام دەسەڵاتی هەبوو، هێزی هـەبوو، هەیبـەتی هـەبوو، ئـەو گرفـتو كێشـانەی ئێسـتا هـەن: مـافی ئـافرەتو، ئافرەت مەزڵوومەو، ئەوە وایەو ئەوە واچووا كـاتی خـۆی ئەوانـە هیچـــیان نـــەبوون، خـــەڵك لـــە مســـوڵمانانەوە فێـــری مـــافو ئازادییـەكان، دەبـوون، بـەڵام ئێسـتا زۆرێـك لـە مسـوڵمانان وایـان لێكراوە، لە هەموو شتێكی خۆیان بكەونە گومانەوە!

www.alibapir.net

لێرەوە وەك برایەكی دڵسۆزتان دەڵێم: با هەمیشە شانازیی بە ئیسلام‌و ئیمانی خۆمانەوە بكەین‌و، پێمان وانەبێ لە قەفەزی تۆمەتباریی داین‌و، پێمان وانەبێ كە ئیسلام نیشانەی پرسیاری لەسەرە، هەر لەبەر ئەوەی دەڵێ: ئافرەت‌و پیاو كۆمەڵێك جیاوازیی ڕیشەییان هەن و، بەگوێرەی ئەو جیاوازییە سروشتییانەیان، پێویستە هەندێك لە ئەرك‌و كارەكانیشیان لێك جیابن، وەك گوتراوە: نان بۆ نانەواو گۆشت بۆ قەساب!

بەڵام كاتێك لە وڵاتێك یان چەند وڵاتێك، یان تەنانەت هەموو دنیاش دا، لە زگماك (فطرة) لادەدات‌و بانگەشەی:

پێكهێنانی خێزانی یەك ڕەگەزیی (الزواج المثلي): دوو پیاو، یان: دوو ژن، دەكاتە یاسا، ئەوە بەشەرییەت لایداوەو لاڕێ بووە، هەروەها بەشەر لایداوە ، كاتێ دەڵێ: ئافرمت‌و پیاو هەر وەك یەكن‌و، لە هیچ شتێكدا جیاواز نین! چونكە دیارە كە جیاوازن! جەستەیان، بەڵكو جۆری بیركردنەوەیان‌و، جێی بایەخ پێدانیان، هەر لە یەكەمین خانە (خلية) كە پیاوی لێ دروست دەبێ، یان ئافرەتی لێ دروست دەبێ، هەر لەوێوە پێكهاتەیان جیایە، ئەو نوتفەیە، ئەو خانەیە هەندێك هۆڕمۆنی تێدان، سیفەتەكانی مێیینەی تێدا پەیدا دەكەن‌و، ئەوی دیكەیان سیفەتی نێرینەو، هەر لەوێوە جیاوازن.

www.alibapir.net

بەڵێ، لەڕووی فەسلەجیی‌و جەستەییەوە، لەچەند ڕوویێکەوە جەستەی پیاو و ئافرەت لێك جیان، هەروەها لەڕووی ناخیانەوە، ئافرەت هەندێ شتی پێ خۆشن، پیاو هەندێك شتی دیکەی پێ خۆشن، ئەوەی جێی گرنگیی پێدانی ئافرەتە جیایە، لەوەی جێی گرنگی پێدانی پیاوە، ئافرەتێك و پیاوێك بەرە شوێنێك، دوایی لەهەرکامیان بپرسە: چیت دی؟ پیاوەکە باسی هەندێك شت دەکا، کە لەگەڵ سروشتی پیاوان دا دەگونجێ‌و، ئافرەتەکەش باسی هەندێك شت دەکا، کە لەگەڵ سروشتی ئافرەتاندا دەگونجێ، هەرکامیان جێی بایەخ و گرنگیی، جیایە لەوی دیکە.

لێرەدا مەبەستم ئەوە نیە بڵێم: ئافرەت‌و پیاو، دوو مەخلووقی جیان لە هەموو شتێك دا، بە دڵنیاییەوە خاڵی هاوبەشیان زۆرن، بەڵام شتێکی ئاشکرایە، یەکێکیان نێرەو یەکێکیان مێ یەو، ئەو نێرایەتیی‌و مێ یاتییەش، کۆمەڵێك سیفەت‌و تایبەتمەندیی جیاوازیان لێ پەیدا دەبن.

ئنجا بێگومان نێربوون‌و مێ بوون، لەخودی خۆیان دا، هیچ کامیان چاکیی (فضیلة)و نوقسانیی (نقیصة) نین، کەچی ئێستا وایان لێکراوە: دەڵێن: تاکو ئێستا هەر پیاو سالاریی بووە، ئنجا دەبێ بیکەینە ژن سالاریی، بەڵام بەدرێژایی مێژوو پیاوان زیاتر توانای ئەوەیان هەبووە سەرکردایەتیی بکەن‌و، ببنە سەرۆکی

www.alibapir.net

دەوڵـەت، یـان ببنــە جـەنگاوەری جـەنـگ، زیـاتر پیـاوان وابـوون، سروشـتـەکەیان وایــە، ئنجـا ئەگـەر لــە ولأتـانی مسولّماننشـین دا شەریعەت ڕێـی لـەژن گرتـوە، فـەرموون لـە ئـەمریکا کێ ڕێـی لێ گرتوە! لە ولأتانی دیکەی دنیا کێ ڕێـی لێ گرتـوە! کـە مەگـەر بـە دەگمــــەن، ئەگــــەرنا ئافرەتێــــك نابێتــــە ســــەرۆکی دەوڵــــەوت، هەرچەندە ئایینو کلتووریش ڕێی لێ نەگرتوون!!

کەواتە ئافرەتو پیاو لە ئیسلامدا، لە هـەموو شـتێکدا یەکسـانن، جگـە لــەوەی جیـاوازیی سروشــتیان دەیخـوازێ، هەنـدێك شـتی سروشتیان لێك جیایـەو، ئـەو لێـك جیاییـەش، مامەڵـەی جیـاواز دەخوازێ، ئەوە بەدەست ئێمە نیە.

ئنجا مەسەلەی جەندەر، دەڵێن: نابێ باسی نێرو مێ بکرێ! ئایـا مرۆڤـی وا هەیــە نــە نێــر بــێ، نــە مــێ بــێ، مەگــەر تووشــی نەخۆشـییەك بـووبێ، ئـەوەی کـە نـە نێرەو نـە مـێ، نێرەمـوك (خُنثی) ، نەخۆشە ، ئەگەرنا مرۆڤی ساغ، یان نێرە، یان مێ یـە! چــونکە زۆرجــار باســی ئــەوەش دەکــەن، دەڵــێن: مــرۆڤ بــەبێ لەبەرچاوگرتنی ڕەگەزەکەی! بەڵام بەبێ لەبەرچاوگرتنی ڕەگەز، مرۆڤ، مرۆڤ نیە، مرۆڤ ئەگەر مرۆڤ بێ، یان نـێرە یـان مـێ، یـان ئەوەتا حاڵـەتێکی نەخۆشییو کەموکوڕییـە، کـە هیچیان نـەبێ،

www.alibapir.net

یان هەردووکیانی یەکسان بن، کە لە شەریعەتدا ئەوەش باس کراوە، لەژێر ناوونیشانی: نێرەمووك (خُنثى)دا.

بۆیە لەو بوارەدا ئێمە دەبێ وریا بین! هەم برایان، هەم خوشکان:

١- جاریٚ برایان لەوە وریا بن! کە ئێمە نابێ نکوولیی لەوە بکەین، کە کۆمەڵگاکەمان لەزۆر ڕووەوە دواکەوتوویەو، لە مامەڵە لەگەڵ ئافرەتیشدا هەر دواکەوتوویە، نکوولیی لەوەناکرێ: زۆر ماف هەن، شەریعەت بە ئافرەتی داون، بەڵام ڕێی لێ گیراوەو، ئەوە دەبێ ڕاست بکرێتەوە.

ئەگەر تەماشای کۆمەڵگای پێغەمبەر ﷺ بکەین، دەبینین: ئافرەتان ڕێ لەبەردەمیاندا ئاچووخ بووە، هەڵبەتە بە ئاسانییش، ئەوە دەستەبەر نەبووە، بەڵکو خەڵك ڕەخنەی گرتوە، چۆن وا دەبێ! گوتوویانە: تاکو ئێستا ژنان هیچ حیسابمان بۆ نەکردوون؟ بۆ نموونە: لە (صحيح البخاري)[1]دا هاتوە، کە عومەر (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: ئێمە لە مەککە حیسابمان بۆ ئافرەتان نەدەکرد، کە هاتینە مەدینە تەماشامان کرد ئافرەتان بەسەر پیاوەکاندا زاڵ بوون، یانی: مافیان پێدراوە،

[1] صحيح البخاري: ٥٥٠٥ .

www.alibapir.net

چونکه مەدینە کۆمەڵگایەکی ئیسلامییەو، دەوڵەتی مسوڵمانانە، بێگومان مەککەش کۆمەڵگای نەفامیی بووە، دەڵێ: ئێمە لەشاری مەککە هیچ حسابمان بۆ ئافرەتان نەدەکرد، تاکو هاتینە مەدینە، دەڵێ: ڕۆژێك لە خێزانم تووڕە بووم گوتم: چۆن دەبێ تۆ قسە لە قسەی پیاواندا بکەی؟ گوتی: دەنا هاوسەرانی پێغەمبەر ﷺ قسەی لەگەڵدا دەکەن‌و، وەڵام‌و ڕەددی قسەی دەدەنەوەو، قسە لە کاروباری دا دەکەن! عومەر گوتی: ئەگەر وابێ (حفصة) بە هیلاك چووە، [(حفصة) کچی عومەر بوو (خوا لێیان ڕازی بێ)]، چۆن ڕەددی پێغەمبەر ﷺ دەداتەوەو، قسەی لەگەڵدا دەکات‌و، ڕەخنەی لێ دەگرێ‌و تێبینیی دەڵێ؟!

لە ڕاستییدا ئەو شتانەی کە کلتووری سەقەتی کۆمەڵگاو، پەروەردەی سەقەتی کۆمەڵگاو، عادەت‌و نەریتی ناشەرعیی کۆمەڵگا، لەسەر ئافرەتی سەپاندوون‌و دەست‌و پێیان بەستوە، دەبێ لایانبەرین، ئنجا ئەوە چاکەو خێرپێکردن نیە کە وا بکەین، بەڵکو ئەوە ئەرکێکی شەرعییە.

٢- بەڵام لەلایەکی دیکەشەوە: ئافرەتانیش دەبێ وریا بن! چونکە ئەوەی کە عەلمانییەکان دەیڵێن:

یەکەم: پێچەوانەی سروشتی پیاوو ئافرەتە.

www.alibapir.net

دووەم: پێچەوانەی بەرژەوەندیی ئافرەتان خۆشیانە.

ئێستا لە ئەورووپا، لە ئەنجامی ئەوەدا کە پێیان وایە ئافرەت دەبێ ئیشی پیاوان بکاو، وەك پیاو بکات، ئنجا لەگەڵیدا یەکسان دەبێ! ئافرەتیان بردۆتە مەیدانێکەوە بۆ پێشبڕکێ لەگەڵ پیاودا کە مەیدانی پیاوەو، بێگومان هەر پیاو پێشێ دەکەوێتەوە، ئایا ئافرەتێك و پیاوێك وەك یەك کۆڵی قورسیان بۆ هەڵدەگیرێ؟! یان وەك یەك هەندێك کاری فیکرییان بۆ دەکرێ؟! وەك چۆن ئەگەر پیاویش لە مەیدانێکدا کە هی ئافرەتە، پێشبڕکێی لەگەڵ بکات، ئافرەت پێش دەکەوێتەوە.

ڕاو هەڵوێستی هاوسەنگیش لەوبارەوە ئەوەیە، کە پیاوو ئافرەت:

١) هەردووکیان مرۆڤن.

٢) هەردووکیان بەندەی خوان.

٣) هەردووکیان بەرپرسیارن بەرامبەر بە کۆمەڵگا.

وەك خوای دادگەر لە ئایەتی ژمارە (٧١)ی سوورەتی (التوبة)دا، زۆر جوان ڕوونی دەکاتەوە: ﴿ وَٱلۡمُؤۡمِنُونَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتُ بَعۡضُهُمۡ أَوۡلِيَآءُ بَعۡضٖۚ يَأۡمُرُونَ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَيَنۡهَوۡنَ عَنِ ٱلۡمُنكَرِ وَيُقِيمُونَ

www.alibapir.net

ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤۡتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَيُطِيعُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓۚ أُوْلَٰٓئِكَ سَيَرۡحَمُهُمُ ٱللَّهُۗ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٞ ﴿٧١﴾ التوبة .

واتە: پیاوانی بڕوادارو ئافرەتانی بڕوادار، هەندێکیان دۆستو پشتیوانی هەندێکیانن: فەرمان بە هەرچی پەسندە دەکەنو، ڕێگریی لەهەرچی ناپەسندە دەکەنو، نوێژ بەرپادەکەنو، زەکات دەدەنو، فەرمانبەریی خواو پێغەمبەرەکەی دەکەن، ئەوانە خوا بەزەیی پێیان دا دێ، بێگومان خوا زاڵی کارزانە.

ئەو شەش بوارە ئەرکی هاوبەشن، بەڵام هەندێك ئەرکی دیکە هەن، بە ئافرەت نەبێ جێ بەجێ ناکرێن و، هەندێکیشان بە پیاو نەبێ جێ بەجێ ناکرێن.

کەواتە: دەبێ پیاو و ئافرەت لە ئەرکە هاوبەشەکاندا پێکەوە هاوکار بن، بۆ ئەرکە تایبەتەکانیش: پیاو ئەرکی خۆی جێ بەجێ بکا، ئافرەتیش ئەرکی خۆی جێ بەجێ بکا، نە کارکردن لە دەرەوەی ماڵ لە ئافرەت قەدەغەیە، بە ئەدەبی شەرعییەوە، نە هاوکاریی کردنی پیاو بۆ بەڕێوەبردنی ماڵو منداڵی خۆی، لە ماڵەوە قەدەغەیە، ئەویش دیسان لە سنووری شیاوی خۆیدا.

ameer.maktab@yahoo.com

 /AliBapir  /AliBapir  /MediaAmeerOffice

www.alibapir.net

www.alibapir.net

شایانی باسە دواندنەکان (خطابات)ی قورئانیش گشتیین، بۆ هەردوو ڕەگەزەکە، وەك:

١) ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ﴾ - ئەی خەڵکینە - ، ڕۆژێك (أم سلمة) (خوا لێی ڕازی بێ) خێزانی بەڕێزی پێغەمبەر ﷺ، قژداهێنەر (ماشطة)یێك، سەری دادەهێنا، گوێی لێ بوو، گوترا: (یا أیهاالناس)، گوتی: تۆزێ دووربکەوە، با بچم بزانم پێغەمبەر چی دەفەرموێ؟ ئەویش گوتی: دەفەرموێ: ﴿یا أیهاالناس﴾ بانگی تۆ ناکات، تەنیا بانگی پیاوان دەکات! گوتی: (أنا من الناس) منیش لە خەڵکم، ئافرەتەکە وایزانیوە: وشەی (الناس) تەنیا پیاوان دەگرێتەوە[1].

٢) ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟﴾ - ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! - ، هەموو زانایانی ئوصوڵی فیقە دەڵێن: ئەو صیغەیە پیاوو ئافرەت دەگرێتەوە.

٣) ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلْإِنسَٰنُ﴾ ئەی مرۆڤ!

٤) ﴿يَٰبَنِىٓ ءَادَمَ﴾، ئەی وەچەی ئادەم!

---

[1] صحيح مسلم: ٢٢٩٥، و شرح صحيح مسلم للنووي، ج ١٥ ص ٥٦ .

www.alibapir.net

ئـەم صـیغانە گشـتییو گشـتگیرن، بـۆ هـەردووك ڕەگەزەكـە بـێ جیاوازیی.

**مەسەلەی پێنجەم: كۆمەڵگایە كە شەریعەت پیادە دەكا:**

بـە بۆچـوونی مـن لەسـەدا نـەوەد (٩٠٪)ی شـەریعەت، كۆمـەڵگا بۆخـۆی خۆبەخشـانە جـێ بـەجێی دەكـاتو، لەسـەدا دە (١٠٪)ی دەستەڵاتی سیاسیی جێ بەجێی دەكات.

كەواتە: نابێ لە شەریعەتەوە ڕامێنین، حوكمەكانی پەك بخرێن، بەبیانووی نەبوونی دەوڵەتو قەوارەی سیاسییەوە!

جارێ شەریعەت یانی: ئیسلام هەمووی، ئەو چەمكو واتایەی كە خـوا (سـبحانە وتعـالی) وشـەی شـەریعەتی پـێ بـەكارهێناوە، لـە قورئاندا، ئەوەیە:

١) ﴿ لِكُلٍّ جَعَلْنَا مِنكُمْ شِرْعَةً وَمِنْهَاجًا ۚ وَلَوْ شَاءَ اللَّهُ لَجَعَلَكُمْ أُمَّةً وَاحِدَةً وَلَٰكِن لِّيَبْلُوَكُمْ فِي مَا آتَاكُمْ ۖ فَاسْتَبِقُوا الْخَيْرَاتِ ۚ إِلَى اللَّهِ مَرْجِعُكُمْ جَمِيعًا فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُونَ ﴿٤٨﴾ ﴾ المائدة: ٤٨.

www.alibapir.net

٢) ﴿ ثُمَّ جَعَلْنَٰكَ عَلَىٰ شَرِيعَةٍ مِّنَ ٱلْأَمْرِ فَٱتَّبِعْهَا وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَآءَ ٱلَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ ﴿١٨﴾ ﴾ الجاثية: ١٨.

٣) ﴿ شَرَعَ لَكُم مِّنَ ٱلدِّينِ مَا وَصَّىٰ بِهِۦ نُوحًا وَٱلَّذِىٓ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ وَمَا وَصَّيْنَا بِهِۦٓ إِبْرَٰهِيمَ وَمُوسَىٰ وَعِيسَىٰٓ أَنْ أَقِيمُوا۟ ٱلدِّينَ ﴾ الشورى: ١٣.

٤) ﴿ أَمْ لَهُمْ شُرَكَٰٓؤُا۟ شَرَعُوا۟ لَهُم مِّنَ ٱلدِّينِ مَا لَمْ يَأْذَنۢ بِهِ ٱللَّهُ ۚ ﴾ الشورى: ٢١.

**وشەکانی: (شرعة) و (شريعة) و (شرع) لەو چوار شوێنانەو، هەر شوێنێکی دیکەش لە قورئان دا، یانی هەموو ئیسلام، ئنجا ئایا هەموو ئیسلام، چ پەکی لەسەر دەسەلات کەوتوە؟ ئایا مسوڵمانان هەر کات دەسەڵاتیان نەکەوتە دەستو، قەوارەی سیاسییان نەبوو، مانای وایە: بوردراون لەوەی کە پابەند بن بە ئیسلامەوە؟! بێگومان، نا، چونکە: ئیسلام: ئیمانو عەقیدەکەی بە تاکەکان هەڵدەگیرێ، هەروەها عیبادەتو دروشمەکان، ڕەوشتە شەخصییەکان، ئەدەبە کۆمەڵایەتییەکان، حەڵاڵو حەرامە بنەڕەتییەکان، کە پەکیان لەسەر دەوڵەت نەکەوتوە، هەموویان دەبێ جێ بەجێ بکرێن، بەبۆچوونی من ئەوەی دەمێنێتەوە،**

www.alibapir.net

پەراویزیکی لە سەدا دە (١٠٪)یی، یان کەمترە: بۆ دەسەلاتی سیاسیی، ئەویش ئەو یاسا شەرعییانەن، کە بەبێ دەستەلات جێ بەجێ ناکرێن، وەك: سزای تۆڵە، سزای دزیی، سزای ڕێگریی، سزای داوێن پیسیی، سزای بوختان کردن، ئەو سزایانە، کە دەبێ دەسەلاتی سیاسیی بیانچەسپێنێ، هەروەها ڕێگرتن لە زوڵم و چەسپاندنی دادگەریی و، دابین کردنی پێداویستییەکان، ئەوانە دەوڵەت مولزەمە کە جێ بەجێ یان بکات، بەلام زۆربەی هەرە زۆی حوکمەکانی شەریعەت، لەلایەن کۆمەڵگاوە، خۆبەخشانە دەبێ جێ بەجێ بکرێن.

کەواتە: بەبێ هەبوونی کۆمەڵگایەکی مسوڵمان، قسەکردن لە جێ بەجێ کردنی شەریعەت، شتێکی زیادەیە، دەبێ کۆمەڵگایەك هەبێ، ئنجا ئەو کۆمەڵگایە، زۆربەی هەرە زۆری شەریعەت: سەدا نەوەد (٩٠٪)ی خۆی جێ بەجێ ی دەکا، ئەوی دیکەش دەمێنێتەوە، تاکو دەسەلاتێکی سیاسیی پەیدا دەبێو جێ بەجێی دەکا، بۆیە ئەگەر کۆمەڵگایەکی مسوڵمان نەبێ، کە زۆربەی هەرە زۆری شەریعەتی بۆخۆی جێ بەجێ کردوە، قسە کردن لە جێ بەجێکردنی شەریعەت، لەجێی خۆی دا نیە.

بۆیە زۆر گرنگە ئێمە جارێکی دیکە تەماشای کۆمەڵگاکەی خۆمان بکەینەوە، بەڵێ کۆمەڵگاکەمان وادانراوە کەمسوڵمانەو

www.alibapir.net

لەسەر ئیسلام حیسابە، بەلاّم ئایا چەندی بە ئیسلام ڕازییە؟! زۆرجار بیردەکەمەوە: ئایا ئەو خەڵکە، هەمووی بۆ نموونە: ڕەوشتی ئیسلامیی، وەك لە قورئان‌و سوننەتدا هاتوە، هەمووی قبووڵە؟ یان هەر ئەوەندەی قبووڵە کە لەگەڵ ئارەزووی ئەودا دەگونجێ، یاخود زەرەری بۆ بەرژەوەندییە ناشەرعییەکانی ئەو نیە؟ یانی: با خۆمان بەوە هەڵنەخەڵەتێنین، بڵێین: میللەتەکەمان هەمووی مسوڵمانە، ئەدی بۆچی ئێستا ئاوا بەجێماوو شپرزین؟! بەڵێ میللەتەکە هەمووی مسوڵمانە، بەلاّم چەندی لە ئیسلام تێگەیشتوەو، چەندی بۆ پابەندیی بەئیسلامەوە ئامادەیە؟! تەماشای کۆمەڵگای پێغەمبەر ﷺ بکەن! لە جەنگی ئوحوددا سێیەکی سوپایەکە، گەڕایەوە لەگەڵ (عبدالله بن أبي بن سلول)[1]دا، لەڕیوایەتێکدا هاتوە دەڵێ: (فما کان بأقل الجمعین)، ئەوانەی کە لەگەڵ (عبدالله بن أبی بن سلول) گەڕانەوە، کەمتر نەبوون لەوانەی کە لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ چوو بوون، لە گەرمەی جەنگدا!! ئنجا ئەو هەموو موونافیق‌و دڵ نەخۆشانە، کە ئەو هەموو ئایەتانە دەربارەی نیفاق‌و موونافیق‌و دڵ نەخۆشەکان هاتوون!

---

[1] السيرة النبوية لإبن هشام ، ج ٣ ص ١٥، ١٦ .

www.alibapir.net

ڕۆژێك زانایەك لە حەسەنی بەصڕیی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەپرسێ، ئەرێ ئیمام لە بەسڕا، هیچ موونافیقت پێ شك دێن؟ (بێگومان مەبەستی كەسێك نەبووە: سیفەتی نیفاقی تێدابن، چونكە مسوڵمانانێك كە بەسیفەتەكانی موونافیقەكانەوە گیرۆدە دەبن، كەم نین، بۆ نموونە: درۆ كردن، خیانەت، بێ بەڵێنیی) ئەویش دەڵێ: وامزانی جەنابت زۆر شارەزای، بڕوا بكە موونافیقەكان لە بەسڕا بچنە دەرێ، سامێی لێ دەكەی وا چۆڵ دەبێ! بێگومان، ئەو مەبەستی ئەوانەش بووە كە سیفەتی ئەهلی نیفاقیان تێدایە.

مەبەستم ئەوەیە: با پێمان وا نەبێ ئەو كۆمەڵگاو خەڵكە هەمووی مسوڵمانی تەواو عیارەو، هەر ئەوەی دەوێ: ئێمە دەسەڵاتێكمان هەبێو شەریعەتی بەسەردا پیادە بكەین! نەخێر پێم وایە دەبێ لە بواری تێگەیاندنو پێگەیاندنی خەڵكو، بۆ لای خوا بانگكردنەوەیانو، بە ئیسلام ئاشناكردنەوەیانو، ئیقناعكردنەوەیانو، ئیسلام لە لا شیرین كردنیان دا، دەبێ كاری جیددیی بكەینو، بۆ جێ بەجێ كردنی شەریعەت، پێویستە لەوێوە زەمینەسازیی بكرێ.

ameer.maktab@yahoo.com

 /AliBapir  /AliBapir  /MediaAmeerOffice

www.alibapir.net

www.alibapir.net

**مەسـەلەی شەشـەم: سـزا شـەرعییەکان، کۆتـا حوکمـەکانی شەریعەتن:**

بـەڕێزان! ئـەمیش مەسـەلەیەکە زۆر گرنگـە، کـە بەڕاسـتو دروستیی لێی تێبگەین: سـزا شـەرعییەکان (العقوبات الشرعية) دوایین حوکمەکانی شەریعەتن کە: پاش زەمینـە بـۆ ڕەخسانیان، پیـادە دەکـرێن، ئـەویش دوای ئـەوە کـە کۆمـەڵگا فێـر کـراوە، پەروەردە کراوەو، پێداویستییەکانی بۆ دابین کراون.

ئایا بەڵگەمان چییە لەو بارەوە؟!

١) تەماشا بکەن! لە سـووڕەتی (النـور)دا: ١- سـزای زینـا، ٢- سـزای بوختان، ٣- سزای لیعان، ٤- هەروەها باسی پۆشاك لەبەر کـردنو، ٥- باسـی مۆڵـەت خواسـتن بـۆ چـوونە مـاڵی یەکـدی، ٦- باسـی کۆمـەڵێکی دیکـە لـە حوکمـە شـەرعییەکان کـراوەو، ئـەو سووڕەتەش لە ساڵی پێنجەمو شەشەمی کۆچییدا دابەزیوە.

٢) هەروەها لە سووڕەتی (المائدة)دا: کە دایکمان عائیشە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: دوا سووڕەتە – کە پێکەوە – دابەزیوەو، هیچ مەنسووخی تێدا نیە: ١- سزای دزیی، ٢- سزای ڕێگریی، ٣- سزای قەتڵ، ٤- قەدەغەکردنی یەکجاریی مەیخۆریی‌و قومارو یانسیب، ئەوانە هەموویان لەو سووڕەتەدا هاتوون، کە لەساڵی حەوتەمو

هەشتەمدا دابەزیوە، چونكە دوای صوڵحی حودەیبیە دابەزیوە، بە بەڵگەی ئەو ئایەتەی كە دەفەرموێ: ﴿ وَلَا يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَـَٔانُ قَوْمٍ أَن صَدُّوكُمْ عَنِ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ أَن تَعْتَدُوا۟ ﴾( المائدة: ٢)، واتە: با ڕق لێبوونەوەتان لە كەسانێك كە ئێوەیان لە مزگەوتی حەڕام قەدەغە كردو گێڕایاننەوە، واتان لێ نەكات دەستدرێژیی بكەن.. ئایا كەی موشریكەكان مسوڵمانیان، لەسەردانی مزگەوتی حەرام (المسجد الحرام) گێڕایەوەو، نەیانهێشت بچن؟ بێگومان لە ساڵی شەشەمی كۆچیی دا، كە صوڵحی حودەیبییەی لێ كەوتەوە.

كەواتە: وەك گوتمان: سزا شەرعییەكان لە كۆتا ڕۆژگارو سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ دابەزیون، دوای ئەوەی خەڵك تێگەیەندراوەو، پێگەیەندراوە، وشیار كراوەتەوە، هەروەها دوای ئەوەی پێداویستییەكانیان بۆ دابین كراون! بەڵێ جێبەجێكردنی شەریعەت، لە سزادانی خەڵكەوە دەست پێ ناكات، بەڵكو لە دابین كردنی پێداویستییەكانیانو، لە پەروەردەو فێركردنەوە، لەوە دەست پێ دەكا، ئنجا دوایی هەر كەسێك مەترسیی بوو بۆ سەر:

www.alibapir.net

١) ژیانی خەڵك، ٢) نەفسی خەڵك، ٣) نامووسی خەڵك، ٤) ئابڕوو و كەڕامەتی خەڵك، ٥) ماڵو سامانی خەڵك، ٦) هێمنییو ئاسایشیی خەڵك، شەریعەت سزای بۆ دیاریی كردوە.

**مەسەلەی حەوتەمو كۆتایی: بنەما گرنگەكانی كاری ئیسلامیی سەركەوتوو:**

پێم وایە: كاری ئیسلامی سەركەوتوو، دەبێ ئەو حەوت بنەمایەی خوارەوە، ڕەچاو بكا:

١) پلە پلەیی (التدرج).

٢) دیاریی كردنی لەپێشترەكان (تحدید الأولویات)، چ شتێك لەپێش چ شتێكەوە بێ؟

٣) ڕەچاوكردنی هاوسەنگییەكان (الموازنات).

٤) لەبەرچاوگرتنی دەرئەنجەمانەكان.

وەختێ حوكمێكی شەرعیی جێ بەجێ دەكرێ، چی لێ دەكەوێتەوە؟ یان فەرمان بە چاكە، یان نەهی لە خراپە، چی لێ

www.alibapir.net

دەكەوێتەوە؟ دەبێ لەبەر چاوی بگرین، نەك من ئاوا دەكەم‌و، چ دەقەومێ با بقەومێ!

٥) باش تێگەیشتنی واقیع (فقه الواقع).

٦) لەبەرچاوگرتنی ئەو ڕاستییە، كە خوا حەز ناكا نیعمەتەكانی قەدەغە بكرێن‌و، بازنەی حەرامەكان فراوان بكرێ.

٧) بناغە لە خواپەرستییەكاندا، بریتیە لە ڕێ لێ گیران‌و، بناغە لە هەڵسوكەوتەكاندا بریتیە لە ڕێپێدران‌و، دەستكراوەیی.

ameer.maktab@yahoo.com
 /AliBapir  /AliBapir  /MediaAmeerOffice
www.alibapir.net

www.alibapir.net

ئێستاش با سەروتیشك بخەینە سەر هەركام لەو حەوت بنەمایە:

١- پلەپلەیی (التدرج):

پلەپلەیی یاسای خوایە لە دروستكراوی داو لە فەرمانی دا:

أ) لە دروستكراو (خلق)ی خوادا:

خوا هیچ شتێكی دروست نەكردوە، مەگەر پلە پلە، بۆ نموونە:

١- مرۆڤ (نطفة) یەكە، و دەبێتە (عَلَقة)و، دەبێتە (مضغة)و تا دوایی.

٢- هەروەها درەخت، پێشێ پنجە گیایەكە، چەكەرە دەداو، دوایی گەورە دەبێ.

٣- هەروەها ئاسمانەكانو زەوی، خوا بە شەش قۆناغ خولْقاندوونی.

ئەوەی باسی پلەپلەیی نەكرابێ بۆ دروستكردنی، تەنیا ڕووحە، ڕووحیش خوا لەبارەیەوە دەفەرموێ: ﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلرُّوحِۖ قُلِ ٱلرُّوحُ مِنۡ أَمۡرِ رَبِّي ﴾ (الإسراء: ٨٥)، واتە: لە بارەی ڕووحەوە

www.alibapir.net

پرسیارت لێدەکەن؟ بڵێ: ڕووح لە کاری پەروەردگارمە.. وا پێ دەچێ ڕووح بە فەرمانی ڕاستەوخۆ، خوا دروستی کردبێ، ئێمە نازانین ڕووح چییە، بەڵام ئەوەی کە ئێمە پێی ئاشناین، ئەو دروستکراوانە هەموویان، خوا بەشێوەی پلە پلەیی دروست بوون.

ameer.maktab@yahoo.com
 /AliBapir  /AliBapir  /MediaAmeerOffice
www.alibapir.net

**ب) لە فەرمانی خوادا:**

شەریعەتی خواش دیسان پلە پلەیی ڕەچاوکردوە.

با نموونەیەك بێنینەوە: قەدەغەکردنی شەڕاب‌و قومار، بەتایبەتی شەڕاب، کە بە چوار قۆناغ قەدەغە کراوە:

١- یەکەمین ئایەت لە سوورەتی (النحل) ئاماژەی پێ دەکا، کە دەفەرموێ: ﴿وَمِن ثَمَرَٰتِ ٱلنَّخِيلِ وَٱلۡأَعۡنَٰبِ تَتَّخِذُونَ مِنۡهُ سَكَرًا وَرِزۡقًا حَسَنًا﴾ (النحل: ٦٧)، واتە: لە تریێ‌و لە خورما ماددەی سەرخۆشکەرو، ڕزقێکی باشیشی لێ دروست دەکەن، (کە مێوژو دۆشاو و باسووق و سجووق‌و ...هتدە).

www.alibapir.net

٢) دوایی خوای پەروەردگار لە سوورەتی (البقرة)دا، ئاماژەیەکی دیکەی پێ دەکات: ﴿يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْخَمْرِ وَٱلْمَيْسِرِ ۖ قُلْ فِيهِمَآ إِثْمٌ كَبِيرٌ وَمَنَٰفِعُ لِلنَّاسِ وَإِثْمُهُمَآ أَكْبَرُ مِن نَّفْعِهِمَا ۗ﴾ (البقرة: ٢١٩)، واتە: لەبارەی مەیی‌و قومارەوە پرسیارت لێدەکەن؟ بڵێ: گوناهێکی گەورەیان تێدایەو، چەند سوودێکیش بۆ خەڵك، بەڵام گوناهەکەیان لە سوودەکەیان گەورەترە.

٣) پاشان لە سوورەتی (النساء)ش دا، فەرمووی: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَقْرَبُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنتُمْ سُكَـٰرَىٰ حَتَّىٰ تَعْلَمُوا۟ مَا تَقُولُونَ﴾ النساء: ٤٣. واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! بەسەرخۆشیی توخنی نوێژ مەکەون، هەتا دەزانن چی دەڵێن..

٤) قۆناغی چوارەم و کۆتایی ئەوەیە کە خوا دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا ٱلْخَمْرُ وَٱلْمَيْسِرُ وَٱلْأَنصَابُ وَٱلْأَزْلَـٰمُ رِجْسٌ مِّنْ عَمَلِ ٱلشَّيْطَـٰنِ فَٱجْتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿٩٠﴾﴾ (المائدة:٩٠)، بەدڵنیایی مەی‌و قومارو بتەکان‌و یانسیب، پیسن، لە کردەوەی شەیتانن، لێیان دووربکەونەوە، بەڵکو سەرفراز بن.

ameer.maktab@yahoo.com

 /AliBapir  /AliBapir  /MediaAmeerOffice

www.alibapir.net

www.alibapir.net

جاروبار كه خەڵكی شەڕاب خۆر لە مەجلیسدا دەبن، دەڵێن: ئەها مامۆستا! خوا نەیفەرمووە: مەیخۆنەوە، فەرموویەتی: ﴿فَاجْتَنِبُوهُ﴾!، بەلاّم بێگومان خوا بۆیە وایفەرمووە:﴿فَاجْتَنِبُوهُ﴾ چونكە ئەم تەعبیرە یانی: مەیكڕن، مەیفرۆشن، دروستی مەكەن، مەیبەن، لەگەڵیان دامەنیشن، هەموو شتێكی پەیوەست بە شەڕابەوە دەگرێتەوە، یانی: هیچ جۆرە هەڵسوكەوتێك لەگەڵ شەڕابدا مەكەن، بەلاّم ئەگەر فەرمووبای: (لاتشربوها) یانی: بەس مەیخۆنەوە، بەلاّم ئێستا یانی: هیچ جۆرە مامەڵەیەكی پێوە مەكەنو لەگەڵدا مەكەن.

بێگومان ئەگەر پلە پلەیی ڕەچاو نەكەین، تووشی دەرەنجامی وا دەبین كە ناشەرعییە، ئاشكراشە بە بیانووی جێ بەجێ كردنی شەریعەتەوە، پێچەوانەی شەریعەت بجووڵێیەوەو، زیان بە شەریعەتو بە سومعەی شەریعەت بگەیەنی، تاوانێكی گەورەیە، خۆتان بینیتان: (داعش) ئەو خەڵكە سەرلێشێواوەی: موسڵو ئەو شوێنانەیان بەدەستەوە بوو، چییان لێ هات! كە بەحیساب شەریعەتیان جێ بەجێ دەكرد! كە ئێستا مەگەر كەسێك جورئەتێكی زۆری هەبێ، ئەگەرنا ناوێرێ باسی تەطبیقی شەریعەتو حوكمی ئیسلام بكات، وایان ناشیرین كرد! كە پێم وایە دەستی موخابەراتی نێودەوڵەتییو، هەندێك لەو دەوڵەتە

www.alibapir.net

بنەماڵەییە میراتییانەی لە پشتەوە بوو، ئەو گرووپەیان دروست کردن، یان لانی کەم ڕێی سەرهەڵدانو گەشەکردنییان بۆ خۆشکرد، تاکو تەوژمی ئیسلامیی ئیحراج و ناشیرین بکەنو، کارێکی وا بکەن خەڵك باسی شەریعەتو باسی حوکمی ئیسلامیی و، دەوڵەتی ئیسلامیی نەکات.

٢- دیارییکردنی لەپێشترەکان، چ شتێك دەبێ لە پێش چ شتێکەوە بێ؟

ئەمیش بنەمایەکی زۆر گەورەو گرنگەو، ڕەچاونەکردنی دەرهاویشتەی زۆر خراپی دەبن، با بۆ ڕوونبوونەوەی دوو نموونە بێنینەوە:

١) دایکمان عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) وەك لە (صحیح البخاري)دا، هاتوە[١]: دەڵێ: ڕۆژێك یەکێك هات بۆ لای، گوتی: دایکی بڕواداران! موصحەفەکەی خۆتم پێ نیشان بدە، گوتی بۆچی؟ گوتی: موصحەفێکی لەبەر دەنووسمەوە، ئەویش زانی پێویستیی بە ئامۆژگاریی هەیە، بۆیە پێی گوت: خوا (سبحانه وتعالی) یەکەم جار سوورەتە کورتەکانی دابەزاندو، باسی بەهەشتو دۆزەخی کرد، ئەگەر خوا یەکسەر فەرمووبای:

---

[١] صحیح البخاري: ٤٩٩٣.

www.alibapir.net

شەڕاب مەخۆنەوەو، دزیی مەکەنو، زینا مەکەن! دەیانگوت: هەرگیز واز لەو شتانە ناهێنین!

مەبەستی ئەوەیە سەرەتا خوا باسی ئیمانو عەقیدەو ڕاستییەکانی ئیسلامی کردوە، ئنجا دوایی فەرموویەتی: وابکەنو وامەکەن!

٢) لە (صحيح البخاري) و (صحيح مسلم)دا هاتوە:[١]

پێغەمبەر ﷺ کە موعازی کوڕی جەبەل (خوا لێی ڕازی بێ) دەنێرێ بۆ یەمەن، پێی دەفەرموێ: (إنك تقدم على قوم أهل كتاب، فليكن أول ماتدعوهم إليه: شهادة أن لا إله إلا الله...)، واتە: تۆ دەچی بۆ لای کەسانێك کەخاوەن کتێبن، (بەحیساب خۆیان بە خاوەن دین دەزانن)، بەڵام با یەکەم شتێك کە تۆ ئەوانی بۆ بانگ دەکەی، بریتی بێ لە: شایەدییدان بەوەی: جگە لە خوا هیچ پەرستراوێك - ی هەق - نیە.

چونکە ئەوان (عیسی)یان لەگەڵ خوا دەپەرستو، (عوزیر)یان لەگەڵ خوا دەپەرست، یانی: لە پێشتر(أولوية) ئەوەیە کە بانگیان بکەی بۆ خوابەیەکگرتن (توحید)، یانی: هەر کەسێك

---

[٢] صحيح البخاري٤٣٤٧ وصحيح مسلم: ٢٩.

www.alibapir.net

دەبێ بزانی داخۆ چ شتێك بۆی لە پێشترە، خۆت بزانە! چ شتێك باشترە و پێویستترە بۆ ئەوان، کار لەسەر ئەوە بکە.

٣- ڕەچاوکردنی هاوسەنگییەکان(الموازنات):

بەتایبەت هاوسەنگیی لەنێوان بەرژەوەندیی (مصلحة)و خراپبوون (مفسدة)دا، دەتوانین لەو بارەوەش زۆر نموونان بێنینەوە:

لە ژیاننامەی (إبن تیمیة)[١]دا هاتوە: ڕۆژێك خەڵکێکی لەگەڵدا دەبێ لە شاگردو قوتابییەکانی، بەلای کۆمەڵێك لە تەتەرو مەغۆلدا دەچن، شەڕاب دەخۆنەوە، دەڵێن: با بچین کەلوپەلەکانیان لێ بشکێنین‌و خواردنەوەکەیان لێ تێك بدەین، دیارە زۆر دەبن‌و دەتوانن لێیان تێك بدەن، ئەویش دەڵێ: لێیان گەڕێن، چونکە ئەوانە هەر سەرخۆش بن باشترە، ئەگەر سەرخۆش نەبن، دەچن ماڵی خەڵکی دەدزن‌و خوێنی خەڵکی بە ناحەق دەڕێژن! واتە: ئەو حاڵەی تێیدان، زیانی کەمترە، یانی: تۆ ئەگەر مەیخواردنەوەکەی لێ تێك بدەی، یەکسەر دابەستێتە نوێژێ، ئەوە زۆر باشە، بەڵام ئەوە ناکات‌و دەچێ خەریکی

[١] بڕوانە: إعلام الموقعین عن رُب العالمین: لإبن القیم ، ج٣ ص ٧ .

www.alibapir.net

شتێکی خراپتر دەبێ، دەبێ: نەهی لە مونکەرێك بکەی، کە مونکەرێکی لەخۆی گەورەتر، یان وەك خۆی نەیەتەجێ، ئەگەرنا دروست نیە ئەو مونکەرە لا بەری، مادام بە مونکەرێکی وەك خۆی، یان لە خۆی گەورەتر شوێنی پڕ بکرێتەوە، یاخود: دەبێ فەرمان بە چاکەیەك بکەی، کە چاکەیەکی وەك خۆی، یان لەخۆی گەورەتر، بەهۆیەوە نەفەوتێ، ئەگەرنا قازانجت سەری مایەت دەخواتو لەسەری قەرزدار دەبیەوەو، ئەوەش دروست نیە.

پێشتریش ئەو فەرموودەیەمان[1] هێنا، کە: پێغەمبەر ﷺ بە دایکمان عائیشەی فەرموو: بۆیە دیواری کەعبە ڕاست ناکەمەوە، چونکە گەلەکەت لە ڕۆژگاری کوفرو شیرکەوە نیزیکن، واتە: نەوەك کێشەیەکیان بۆ دروست بێ، کێشەیەکی فیکریی و عەقیدەییان بۆ دروست ببێ، بۆیە ئەو مەعرووفە ناچەسپێنم، نەوەك مەعرووفێکی دیکەی لەخۆی گەورەتر لەدەست بچێ، یان مونکەرێکی بێتەجێ، کە زیانو گوناهی لە خێرو چاکەی مەعرووفەکە گەورەتر بێ.

ameer.maktab@yahoo.com
 /AliBapir  /AliBapir  /MediaAmeerOffice
www.alibapir.net

[1] صحيح البخاري: ١٥٨٦.

www.alibapir.net

٤- لەبەرچاوگرتنی دەرئەنجامەکان (إعتبار المآلات):

بەڕێزان!

ئەم بنەمایەش بنەمایەکی یەکجار گرنگو گەورەیەو، ڕەچاونەکردنی دەرهاویشتەی زۆر خراپی دەبن، وەك چۆن لەبەرچاوگرتنی دەرەنجامەکانو تێخوێندنەوەیان، ئاکامی زۆر باشی دەبن.

جێی داخو خەفەتیشە کە زۆرێك لەو گرووپو تاقمانەی ناویان لەخۆیان ناوە (جیهادیی)، بەهۆی نەشارەزاییان لە شەریعەتو نائاشناییانو نا بەرچاوڕوونییان لەبارەی واقیعەوە، زۆرجاران خۆیان تووشی چۆرتمو هەڵەی کوشندەو بێڕەزا کردوە.

هەروەها وەك نموونەیەکی نیزیكو زیندووی هاوچەرخمان، دەتوانین ئاماژە بەهەندێك هەڵوێستی هەڵەو کرچو کاڵی ئیسلامییەکانی میصر بکەین:

١) پەلەپەل کردنیان لە گۆڕینی زۆر شتی وڵاتەکەیان، کە ساڵەهای ساڵە سیکۆلاریستەکان خەڵکیان لەسەر ڕادەهێنن.

ameer.maktab@yahoo.com
 /AliBapir  /AliBapir  /MediaAmeerOffice
www.alibapir.net

www.alibapir.net

٢) سەرەتا ڕاگەیاندنی ئەوە کە بەتەمانین بەتەنیا حوکمڕانیی میسر بکەن‌و، دوایی ژیوان بوونەوەیان‌و ڕامالین (إکتساح)ی مەیدانی هەڵبژاردن!

٣) خەیاڵپلاوکردنی حوکمڕانیی کردن بەبێ زەمینەسازیی‌و هەبوونی هێزی: سەربازیی، ئابووریی، ڕاگەیاندن، هەواڵگریی، دیبلۆماسیی...هتد.

دواییش دیتمان چ دەرەنجامێکی خراپ پەیدا بوو!!

کەواتە: زۆر گرنگە سەرەنجامەکان بخوێنینەوەو، هەر ئێستامان لەبەر چاو نەبێ، جاری وایە: لە ئێستادا دەتوانی پاڵەوانیەتییەك بنوێنێ، پاڵەوان بازییەکی باش بکەی، بەڵام دوایی چی لێ دێ! وەك کەسێك کە لە شوێنێکی بەرز خۆی هەڵدەدا، هەتا بەهەواوەیە خۆشە، بەڵام کە دەگاتە عەرزێ، هەموو لەشی دەشکێ!

٥- باش تێگەیشتنی واقیع (فقه الواقع):

بابۆ ڕوونکردنەوەی چەمکی باش تێگەیشتنی واقیع، چەند وێنەیەکتان بۆ دێنمەوە:

www.alibapir.net

١) نموونەی یەکەم: (نهى رسول الله ﷺ عن أكل لحوم الضحايا بعد ثلاث، قال عبدالله بن أبي بكر: فذكرت ذلك لعمرة، فقالت: صدق، سمعت عائشة، تقول: دفَّ أهل أبيات من أهل البادية حضرة الأضحى زمن رسول الله ﷺ، فقال رسول الله: ادَّخروا ثلاثا، ثم تصدَّقوا بما بقي، فلما كان بعد ذلك قالوا: يا رسول الله! إن الناس يتخذون الأسقية من ضحاياهم، و يحملون منها الودك، فقال رسول الله ﷺ: وما ذاك؟ قالوا: نهيت أن تؤكل لحوم الضحايا بعد ثلاث! فقال: إنما نهيتكم من أجل الدافة التي دفت، فكلوا و ادخروا و تصدقوا). رواه مسلم: ١٩٧١. پوختەی واتایەکەی و جێی مەبەستمان، ئەوەیە کە: پێغەمبەری خوا ساڵێك لە دوای سێ ڕۆژان زیاتر پاشەکەوتکردنی گۆشتی قوربانیی قەدەغەکردەوە، بەڵام ساڵی داهاتوو، فەرموویەتی: (کلوا وادَّخروا و تصدَّقوا، إنما نهيتكم من أجل الدافة التي دفَّتْ)، واتە: بخۆن و پاشەکەوتیش بکەن (پارساڵ) لەبەر ئەو خەڵکە غەوارەو هەژارەی هاتبوونە ئێرە، بۆیە لێم قەدەغەکردبوون.

کەواتە: لە ئەنجامی گۆڕانی واقیعەکەدا، پێغەمبەری خواش هەڵوێستو حوکمەکەی، یان فەتوایەکەی گۆڕاوە.

٢) نموونەیەکی دیکە: لە فەرمایشتی ڕاست(صحيح)دا هاتوە، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: (كنتُ نهيتكم عن زيارة القبور،

www.alibapir.net

فزوروها، فإنّها تذكرة بالآخرة). رواه مسلم: ٩٧٧، و أبوداود: ٣٢٣٥، والنسائي: ٢٠٣٢ و لفظ: (فإنها تذكرة بالآخرة) ليس في (صحيح مسلم). واته: پێشتر لێم قەدەغەکردبوون بچنە سەرگۆڕستان، بەڵام ئێستا بچن، چونکە دوارۆژتان دەخاتەوە یاد.

پێشێ نەهی لێ کردوون بچنە سەر گۆڕستان، پیاوان‌و ئافرەتان هەموویان، دوایی فەرموویەتی: بچن، بۆیە پێشێ نەهی لێ کردوون، چونکە مەزەنندەی ئەوەی لێ کردوون، لە ڕۆژگاری شیرك‌و کوفرەوە نیزیکن، نەوەك لە قەبرەکان بپاڕێنەوە، دوایی کە زانیویەتی ئیمان‌و تەوحید لە دڵیاندا چەسپاوە، ڕێی داون، چونکە: ئەو مەبەست‌و ئامانجە گرنگەی کە بیرکەوتنەوەی ئاخیرەتە، دێتە دی‌و، ئەو مەفسەدەیەشی لێ پێشبینیی ناکرێ، کە پێشتر پێشبینیی دەکرا.

٣) وێنەیەکی دیکە: پێغەمبەر ﷺ نەهی کردوە لە دەفرێك دا ئاو بخورێتەوە، کە پێشتر شەڕابی تێدابووە، دوایی لە مەقامێکی دیکەدا، ڕێی دا، تێیان دا بخورێتەوە، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ پێشتر وات فەرمووا فەرمووی: (إنّ الظروف لا تحلُّ، ولا تحرِّمُ، ولكن كلُّ مسكرٍ حرام..)[1]، واتە: قاپ‌و قاچاخ هیچ

---

[1] اخرجه ابن حبان في الصحيح : (١٧٩/١٦) و البيهقي (٦٤/٥) بنحوه.

www.alibapir.net

شتێك حەڵاڵو حەرام ناكات، بەڵام هەموو سەرخۆشكەرێك قەدەغەیە.

واتە: ئێوە بەو دەفرانەوە ڕاهاتبوون، نەوەك كابرا كە تازە شەڕابی خواردۆتەوە، هەركات ئاویان بۆ هێنا، مەیلی بۆ شەڕاب بچێتەوە، وەك كابرای جگەرە كێش، بۆنی جگەرەی بۆ دێ، دەڵێ: جگەرەیەكم بدەنێ.

٤) هەروەها مەسەلەی نرخ لەسەر شت دانان (تسعیر)، هاوەڵان داوایان لە پێغەمبەری خوا ﷺ كرد، نرخیان بۆ لەسەر شمەك و خۆراك دابنێ، بەڵام ئەو ئامادە نەبوو، نەوەك تووشی ستەم ببێ، وەك لەم فەرموودەیەدا هاتووە: (عن أنس قال: غلا السعر في المدينة على عهد رسول الله ﷺ، فقال الناس: يا رسول الله! غلا السعر، فسَعِّر لنا! فقال رسول الله: إن الله هو المسعِّر القابض الباسط الرازق، و إني لأرجو أن ألقى الله، و ليس أحد منكم يطلبني بمظلمة في دم و لا مال). رواه الخمسة إلا النسائي و صححه ابن حبان، سنن أبي داود: ٣٤٥٠، و سنن الترمذي: ١٣١٤، و مسند أحمد: ٢٧٦، و سنن ابن ماجه: ٧٢٠، و الدارمي: (٢/٢٤٩). و الألباني في صحيح الجامع الصغير) (١٣٥/٢).

www.alibapir.net

بەلام دوایی عومەر (خوا لێی ڕازی بێت) لەسەردەمی خۆیدا نرخی لەسەر شتەکان دانا.

ئنجا ئیمام مالیك لە (موطأ)ی خۆیدا لەو بارەوە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ ئەوەی کرد کە بۆ سەردەمی وی باش بوو، عومەریش ئەوەی کرد کە بۆ سەردەمی ئەو باش بوو، یانی: لەسەردەمی پێغەمبەردا ﷺ بازرگانەکان بە ویژدانو، بە ئینساف بوونو، نرخی زیاتریان لەسەر شتان دانەناوە، دوایی کە بازرگانان بێ ویژدان بوون، دەبووایە دەسەلات نرخ لەسەر شت دانێ، تاکو بابای فرۆشیار بە چوار قیمەتو شەش قیمەت شتەکەی نەفرۆشێ، قۆڵی خەڵکی ببڕێ! ئەو کاتە وا چاك بووەو، ئێستاش ئاوا چاکە.

٥) مەسەلەی سەفەری ئافرەت، ئەوە دیارە فەرموودەی پێغەمبەرە ﷺ دەفەرموێ: (لايحل لامرأةٍ تؤمن بالله واليوم الآخر تسافر مسيرة يوم و ليلة إلا مع ذي محرم عليها)[1]. واتە: هەر ئافرەتێك بڕوای بەخواو بەڕۆژی دوایی هەیە، بۆی ڕەوانییە لە ڕێی ماوەی شەوو ڕۆژێك دا، بەبێ مەحرەم، سەفەر بکا.

---

[1] صحيح البخاري: ١٠٨٨، و صحيح مسلم: ١٣٣٩ .

www.alibapir.net

بەڵام فەرموودەی پێغەمبەریشمان ﷺ هەیە دەفەرموێ: (عن عدي بن حاتم قال لـه رسول الله ﷺ حين وفد عليه: أتعرف (الحيرة)؟ قال: لم أعرفها، ولكن قد سمعت بها، قال: فوالذي نفسي بيده، ليتمن هذا الأمر حتى تخرج الظعينة من الحيرة و تطوف بالبيت، في غير جوارِ أحدٍ)[1]. واتە: بەو كەسەی گیانمی بەدەستە دەبێ، هەتا ئافرەتی كەژاوەدار لە شاری حیرەوە بە تەنیا دەچێتە مەككە و تەواف بەیت دەكات، بە بێ پارێزگاریی هیچ كەس.

كەواتە: ئافرەت بەتەنیاش دروستە سەفەر بكات، بەڵام كەی؟ (لیتمن الله هذا الأمر)، كاتێك ئەم دینە خوا تەواوی دەكاو هێمنیی‌و ئاساییش بەرقەرار دەبێ، ئنجا كە هێمنیی‌و ئاساییش بەرقەرار بوو، ئافرەت بەتەنێش سەفەر بكات، لێی قەدەغە نیە، فەرموودەكەی وا دەفەرموێ.

بەڵێ ئەم پرسانە پرسی پەرستشیی (تعَبُدي) نین، وەك نوێژی شێوان، كە هەردەبێ سێ ڕكات بێ، بەڵكو پرسی هەڵس‌و كەوتیین‌و، تەماشای حیكمەتەكەیان دەكەین: حیكمەتی چی بووە، كە ئافرەت نابێ بە تەنێ سەفەر بكات؟! حیكمەتەكەی ئەوەبووە كە ئەوكاتە نەك ژن، پیاویش بەتەنێ سەفەری

---

[1] صحيح البخاري : ٧١١٤ .

www.alibapir.net

کردبایە، ڕووتیان دەکردەوە، حیکمەتەکەی ئەوە بووە کە لە خۆی ترساوەو، وڵات ئەمین نەبووە، ئەدی ئەگەر شێوازی سەفەر کردنەکەو وەزعەکە وابوو، کە ئافرەتی سەفەرکردوو هیچ مەترسیی لەسەر نەبوو؟! بێگومان حوکمەکەی دەگۆڕێ، حیکمەتەکەی لەخۆترسانە، کە ترس نەما، مانای وایە حوکمەکەی دەگۆڕێ.

هەروەها دەتوانین زۆر نموونەی دیکە بێنینەوە.

٦- خوا حەز ناکا نیعمەتەکانی قەدەغە بکرێن‌و بازنەی قەدەغەکراوەکان [illegible] بکرێ:

ameer.maktab@yahoo.com
 /AliBapir  /AliBapir  /MediaAmeerOffice
www.alibapir.net

دەتوانین زۆر ئایەتی لەو بارەوە بهێنینەوە، بۆ وێنە:

١) ﴿ قُلْ أَرَءَيْتُم مَّآ أَنزَلَ ٱللَّهُ لَكُم مِّن رِّزْقٍ فَجَعَلْتُم مِّنْهُ حَرَامًا وَحَلَٰلًا قُلْ ءَآللَّهُ أَذِنَ لَكُمْ أَمْ عَلَى ٱللَّهِ تَفْتَرُونَ ﴿٥٩﴾ ﴾ (یونس: ٥٩)، واتە: بڵێ، ئایا ئەو بژیوە دەبینن کە خوا بۆی دابەزاندوون، لەخۆڕا هەندێکی حەڕامو، هەندێکی حەڵاڵ دەکەن، ئایا خوا فەرمانی پێ کردوون، یاخود بوختان بکەن بەناوی خواوە؟!

ameer.maktab@yahoo.com
 /AliBapir  /AliBapir  /MediaAmeerOffice
www.alibapir.net

www.alibapir.net

٢) هەروەها فەرمایشتێکی پێغەمبەر ﷺ هەیە، دەفەرموێ: (إن الله تعالى فرض فرائض فلاتضيّعوها، وَ حدَّ حدوداً فلا تعتدوها، و حرم أشياء، فلا تنتهكوها، وسكت عن أشياء رحمة لكم غير نسيان، فلا تبحثوا عنها...)[1]. واتە: خوای بەرز هەندێك شتی پێویست کردوون، زایەیان مەکەنو، هەندێك سنووری داناون، مەیانشکێننو، هەندێك شتیشی قەدەغەکردوون، توخنیان مەکەون و، لە هەندێك شتیش گەڕاوە لەڕووی بەزەییەوە بەرانبەرتان، نەك بە لەبیرچوون، لێیان مەکۆڵنەوە. (یانی: پرسیاریان لەبارەوە مەکەن).

هەڵبەتە لێرەدا پێغەمبەری خوا ﷺ ئامۆژگارییەکی گەورەو گرنگیی مسوڵمانان دەکاتو دەفەرموێ: خوا هەندێ شتی واجب کردوەو، هەندێك شتیشی حەڕام کردوەو، هەندێك شتیش لێی گەڕاوەو، بێ دەنگیی لێ کردوە، لێیان مەکۆڵنەوە، لێیان مەپرسن، بۆچی؟ بۆ ئەوەی بازنەی قەدەغەکراوەکان فراوان نەبێ.

هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (ذروني ما تركتكم فإنما أهلك الذين من قبلكم، كثرة مسائلهم و اختلافهم على أنبيائهم) صحيح مسلم: ١٣٣٧.

[1] اخرجه الدارقطني : (١٨٥/٤) وهو حديث حسن.

www.alibapir.net

٣) گرنگە بزانین ڕووحی شەریعەت ڕووی لەوەیە کە خەڵك سەغڵەت نەکرێ، وەك خوای میهرەبان فەرموویەتی:

أ- ﴿ وَمَا جَعَلَ عَلَيْكُمْ فِي ٱلدِّينِ مِنْ حَرَجٍ ﴾ (الحج: ٧٨) ، واتە: خوا سەغڵەتی نەکردوون، لە دینی خۆیدا.

ب- هەروەها فەرموویەتی: ﴿ يُرِيدُ ٱللَّهُ بِكُمُ ٱلْيُسْرَ وَلَا يُرِيدُ بِكُمُ ٱلْعُسْرَ ﴾ البقرة: ١٨٥. واتە: خوا ئاسانیی بۆتان دەوێ‌و، قورسیی‌و ناڕەحەتیی بۆتان ناوێ.

ج- لە سوورەتی (المائدة)ش دا، خوا (سبحانه وتعالى) فەرموویەتی: ﴿ مَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيَجْعَلَ عَلَيْكُم مِّنْ حَرَجٍ وَلَٰكِن يُرِيدُ لِيُطَهِّرَكُمْ وَلِيُتِمَّ نِعْمَتَهُۥ عَلَيْكُمْ ﴾ (المائدة:٦)، واتە: خوا نایەوێ سەغڵەتتان بکا، (کە دەفەرموێ لەجیاتی بەکارهێنانی ئاو بۆ دەستنوێژو غوسڵ، تەیەمووم بکەن)، بەڵکو دەیەوێ پاکتان بکاتەوە.

بەڵێ گرنگە ئێمە تێ بگەین کە ئاڕاستەی شەریعەت بەرەو ئەوەیە، کە خەڵك ئاسانکاریی بۆ بکرێ لە دینداریی‌داو، سەغڵەت‌و ناڕەحەت نەکرێ.

www.alibapir.net

هەروەها زۆریش گرنگە بزانین کە خوا (سبحانه وتعالى) هیچ شتێکی لە خەڵك قەدەغە نەکردوە، مەگەر بە زیانو زەرەریان بێ.

٧- بناغـــه لـــه خواپەرســـتییەکاندا ڕێ لێگیرانـــەو، لـــه هەڵسوکەوتەکاندا ڕێپێدانە:

(الأصل في العبادات: الحظر و المنع، والأصل في المعاملات أو العادات: الإباحة أو العفو)[1]. یانی: بناغـه لـەو شـتانەدا کـه مامەڵـەیان پـێ لەگـەڵ خـوادا دەکـەین، ڕێ لێگیرانە(لـە خزمـەت خـوادا، چ مامەڵەی فیکریی، کە ئیمانو عەقیدەیە، چ مامەڵەی کردەیی کـه دروشمـەکانن)، بناغـه لەوانـەدا ڕێلێگیرانـه و قەدەغەکرانـه و، ڕێپێـدراو تـەنیا ئەوەیـه کـه شـەریعەت گوتوویـەتیو، لـەخۆوە بۆمان نیە، شتێك دابێنین، بـەڵام بناغـه لـه هەڵسوکەوتی نێـوان خۆماندا، ڕێپێدرانـه، مەگـەر پێچەوانەی دەقێکی شـەرعیی بـێ، ئەگەرنا ئەسڵ ڕەواییو ڕێپێدرانە، خـەڵك چۆن مامەڵـه دەکـەن، چۆن پێیان وایە بەرژەوەندییەکانیان بۆ دابین دەبن، با وابکەن.

(إبن القیم) ڕەحمەتی خوا لێ بێ، له کتێبی: (الطرق الحکمیـة في السیاسـة الشـرعیة)و، لـه کتێبـی: (إعـلام الـموقعین عـن ربِّ

---

[1] بڕوانه: (القواعد النورانیة الفقهیة) لابن تیمیة، ص ١١٢، هەروەها( أصول الفقه المهمة) لعبدالرحمن بن ناصرالدین السعدي، ص ١٠٥ ، ١٠٦.

www.alibapir.net

العـالمين)[1]دا و، زانايـانی دیکەش گووتوویانـە: (أینمـا وجـد العـدلُ فـثم شـرع الله)، (أینمـا وجـدت المصـلحة فـثمَّ شَـرْعُ الله)، واتــە: دادگەریی لەکوێ بێ، شەرعی خوا لەوێ یە، بەرژەوەندیی لـەکوێ بێ، شەریعەتی خوا لەوێ یە.

لێـرەدا دێمـە کۆتـایی ئـەم تـەوەری پێنجـەمو کۆتاییـەو، ئومێـدم وایە ئەم کۆمەڵیی ئیسلامییە ، خوا پشـتیوان بێـت، ڕۆژ بـە ڕۆژ، بەهۆی ئەوەوە کە ئێمە عـەقڵو دڵـی خۆمـان فـراوانتر دەکـەینو ئیمـانو عەقیـدەمان زیـاتر دەچەسـپێنینو، پابەنـدیی بـە شـەرع زیـاتر دەکـەینو، ئـەخلاقو ڕەوشـتی خۆمـان جـوانتر دەکـەینو، لەگەڵ خەڵکدا حیکمەتو لێزانـیی زیاتر بە خـەرج دەدەمیـن، ئـەم کۆمەڵیی ئیسلامییە زیاتر ببێتـە جێگای ئومێـدی ئـەو خـەڵكو جەماوەرە کە لە نێویاندا دەژین.

وصلی الله علی محمد وعلی آله اجمعين.

دوا پێداچوونـەوە:

٢٢ ڕەجەبی ١٤٤٠ك

٢٠١٩/٣/٢٩ز

هەولێر

---

١ اعلام الموقعين عن رب العالمين، ج ٤ ص ٤٧٣ .

www.alibapir.net

## ناوەڕۆك

www.alibapir.net

www.alibapir.net

www.alibapir.net



ameer.maktab@yahoo.com
 /AliBapir  /AliBapir  /MediaAmeerOffice
www.alibapir.net

ameer.maktab@yahoo.com






www.alibapir.net

# ناوەندی ڕاهێنان و گەشەپێدان

www.alibapir.net

## زنجیرەی ئاگایی

ئەم زنجیرەیە، ناوەندی ڕاهێنان و گەشەپێدان بە شێوەی نامیلکە دەریدەکات، گرنگی بە پێگەیاندنی ئەندامان و کادیرانی کۆمەڵی ئیسلامیی دەدات لە بەرفراوانکردنی ئاسۆی ڕۆشنبیری و برەودان بە بەرزکردنەوەی ئاستی مەعریفی و هۆشیاریان و پێشخستنی چۆنایەتی ئۆرگانەکان لەسەر بنەمای گرنگی و پێویستی قۆناغەکە.

٢٠١٩ز — ١٤٤٠ ك